چاپی یەکەم

# مەتەڵی مەرگ





د.موستەفا مەحمود

وەرگێڕانی: باسیمە عەبدولستار





ناوی کتێب: مەتەڵی مەرگ
ناوی نووسەر: د. موستەفا مەحموود
ناوی وەرگێڕ: باسیمە عبدالستار
تایپ: سروە تالیب
دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن
دیزاینی تێکست: سلوی
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٩
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ : ١٠٠٠دانە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکانی
ژمارە (١٨١٤)ی ساڵی (٢٠١٩)ی پێ دراوە.








٠٧٥٠١٢٦٩٦٨٩ - ٠٧٧٠١٩٣٢٧٤٩


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە ٦٦

# پێڕست







١





# مەتەڵەکە

هەریەک لە ئێمە جەستەی خۆی داوە بەکۆڵیدا..

هیچ شتێک نییە لە مەرگ سەیرتر بێت..

ڕووداوێکی سەیرە..

کە شتێک ببێت بە هیچ..

جل و بەرگی ماتەمینی و.. خێمەکان و.. موزیک و.. بخوردانەکان و ..کەس و کاری مردوو بە جل و بەرگە شانۆییەکانیانەوە ..

ئێمەش هەروەک بڵێیت تەماشای ڕۆمانێک دەکەین و .. باوەڕ ناکەین .. کەسیش پێوەی دیار نییە باوەڕ بکات ..

تەنانەت ئەوانەش کە بەشداری ناشتنەکەن و بە دوای مردووەکەدا دەڕۆن، تەنها بیر لە ڕێگاکە دەکەنەوە ..

منداڵەکانی مردووەکە تەنها بیر لە میراتییەکە دەکەنەوە و ..

گۆڕهەڵکەنەکان تەنها بیر لە حیسابەکەی خۆیان دەکەنەوە و .. قورئان خوێنەکانیش تەنها کرێکەیان ..

وادیارە هەموو کەس لە خەمی کاتی خۆی یا تەندروستی خۆی یاخود پارەی خۆیدایە و .. هەریەک پەلەی شتێکییەتی کە دەترسێ لە دەستی بچێت ..

شتێک کە مردن نییە هەرگیز ..

پرۆسەی دڵەڕاوکێ دەربارەی مردن، سەرەڕای ئەم هەموو شانۆ کاریگەرانەیە، تەنها دڵەڕاوکێیەکە دەربارەی ژیان ..

لەوە ناچێت کەس باوەڕ بکات یاخود گرنگی بە مردن بدات .. تەنانەت ئەو کەسەش کە تابوتەکەی لە سەر شانی هەڵگرتووە ..

تەختە دارەکە بە ناو گۆشتی شانەکانیدا ڕۆدەچێت و .. ئاوەزیشی ڕاماوە لە ساتی داهاتوو .. ئەوەی کە چۆن چۆنی تیایدا بژی .. کەس خۆی لە مەرگ ناگەیەنێت .. وەلێ ئەوە ژیانە بە لای هەموانەوە گرنگە ..

ئەمە نوکتەیە ..

ئەی کەواتە ئەوە کێیە دەمرێت ؟

مردووەکە ؟

تەنانەت ئەویش .. سەرەنجامی خۆی نازانێت ..

نـرخ و ئەرزشـی تەرمەکـە .. هیـچ نـاکات، ئـەو چەنـد خولەکـە کەمـە نەبێـت کـە هاتوچـۆ تیایـدا دەوەسـتێت بەهـۆی پەڕینەوەیـەوە

پشـوویەکە تیایـدا ئۆتۆمبێلـەکان لەمـلاولادا دەپەسـتێنینەوە .. هـەر ئۆتۆمبێلێـک بـە دڵەڕاوکێـوە خـۆی بەسـەر ئـەوی دیـدا فـش دەکاتـەوە، تـا دڵنیـای بکاتـەوە کـە پەلەیەتـی بـۆ گەشـتن بـە ئامانجەکـەی و .. ئـەو تێنـاگات .. لـەم شـتەی کـە نـاوی مەرگـە ..

مەرگ چییە و .. حەقیقەتەکەی چییە ؟

بۆچـی مـەرگ هەرگیـز لـە بیرکردنـەوەی ئێمـەدا نییـە .. تەنانـەت ئـەو کاتـەش کـە ڕووبـەڕووی دەبینـەوە ..

چونکـە مـەرگ لـە حەقیقەتـی خۆیـدا ژیانـە و .. هیـچ شـتێکی چاوەڕواننەکـراو و کـت و پـڕ لـە خۆناگرێـت و ..

چـون تەنانـەت کاتێـک کـە زیندووشـین، هەمـوو سـاتێک، مـەرگ تیامانـدا ڕوودەدات ..

هـەر پنتێـک لـە لیـک و .. هـەر فرمێسـکێک و .. هـەر دڵۆپێـک ئارەقـە .. چەندیـن خانـەی مـردووی تێدایـە .. کـە بـە بـێ ئاهەنـگ گێـڕان بـەرەو دەرەوە پەرشـیان دەکەیـن ..

لـە خوێنمانـدا .. ملیۆنەهـا خڕۆکـەی سـوور لـە دایـک دەبـن و دەژیـن و دەمـرن .. بـە بـێ ئـەوەی ئاگاداربیـن .. ئەمـە بـە هەمـان شـێوە بـۆ خڕۆکـە سـپییەکان و .. خانەکانـی گۆشـت و چـەوری و

جگـەر و ڕیخۆڵەکانیـش ..

هەموویـان خانـەی تەمـەن کورتـن، لـە دایـک دەبـن و دەمـرن و، هـی دی لـە دایـک دەبـن و ئەوانیـش دەمـرن .. جـا یـا لاشـەکانیان لـە ڕژێنەکانـدا دەنێژرێـن یاخـود بـە ئارامـی و بێدەنگـی لەگـەڵ دەردراوەکانـدا دەکرێنـە دەرەوە .. بـە بـێ ئـەوەی ئێمـە هەسـت بکەیـن شـتێک خەریکـە ڕوودەدات ..

لەگـەڵ هـەر هەناسـە هەڵمژیـن و هەناسـە دانەوەیەکدا .. ئۆکسـجین وەکو گاز دەچێتـە فڕنـی جگـەرەوە ، و بڕێـک گۆشـت دەسـوتێنێت و گەرمییـەک بەرهـەم دەهێنێـت، کـە گۆشـتێکی دیکـەی نوێمـان بـۆ ئامـادە دەکات و، ئێمـەش زیـادی دەکەینـە سەرشـانەکانمان ..

ئـەم گەرمییـە ژیانـە ..بـەڵام لـە هەمـان کاتـدا سووتانیشـە .. مـەرگ لـە کرۆکیدایـە و .. تیاچوونیـش لـە سروشـتیدا ..

کەواتـە شـتە چاوەڕواننەکراوەکـە لـە کوێدایـە لەکاتێکـدا هەریـەک لـە ئێمـە لـە دارەمەیتێـک دەچیـن لەسـەر دوو پـێ دەڕوات .. هەریەکەمـان لـە هـەر سـاتێکدا لاشـەی خۆمـان داوە بەکۆڵمانـدا ..

تەنانـەت بیرۆکەکانیـش لـە سـەرماندا لـە دایـک دەبـن و گـەڵا دەکـەن و دەگەشـێنەوە، پاشـان دەوەرێـن و دەکـەون .. تەنانـەت هەسـتەکانیش .. لـە دڵمانـدا هەڵدەگیرسـێن و تیشـک دەدەنـەوە، پاشـان سـارد دەبنـەوە .. کەسـایەتییەکان، جـار لـە دوای جـار قۆزاخەکـەی خۆیـان تێـک دەشـکێنن و .. لـە شـێوەیەکەوە دەگۆڕێـن بـۆ شـێوەیەکی دی .. ئێمـە هەمـوو سـاتێک .. مەعنەوییانـە دەمریـن

و .. ئەدەبییانــە دەمریــن و .. ماددییانــە دەمریــن ..

ڕاســتتر لەمــەش وایــە بڵێیــن کــە ئێمــە دەژیــن .. ماددییانــە دەژیـن و ئەدەبییانـە دەژیـن و مەعنەوییانـە دەژیـن .. چونکـە هیـچ جیاوازییــەک لــە نێــوان مــەرگ و ژیانــدا بــاس ناکرێــت .. چونکــە خــودی ژیــان پرۆســەی مردنــە ..

چونکــە ئــەو گەڵایانــەی لــە لقەکانــی درەختــەوە دەڕوێــن و .. پاشـان دەوەرێـن و دەمـرن و دەکـەون و .. گـەڵای دیکـە و دیکـە .. دەڕوێـت .. ئـەو پرۆسـە یـەک بـە دوای یەکـە خـودی درەختەکەیـە ..

چونکە ئێستا , لە هەمانکاتدا لاشەی ڕابردووە ..

چونکـە جووڵـە لـە هەمانکاتـدا، لـە شـوێنێکدا بـوون و نەبوونـە .. مـن تەنهـا بەمـە ڕێ دەکـەم و جووڵـە دەکـەم و .. شـتەکانیش لـە گەڵمـدا تێدەپـەڕن ..

چونکـە ژیـان یارییەکـی بەرامبەرانـە نییـە .. بەڵکـو ڕاکێشـان و کێـش کـردن و زۆرانبازییـە لـە نێـوان دوو دژیەکـدا .. وە هەوڵێکـی پەککەوتانەیـە بـۆ ڕێکخسـتن و پێـک هێنانـی ئـەم دوو دژیەکـە لـە چەنـد پێکهاتەیەکـی تەنکۆڵـەدا، کـە خۆیـان لـە خـودی خۆیانـدا پێویسـتیان بـە پێـک هێنانـە ..

جارێـک و .. دووجـار و چەنـد جارێـک .. بـە بـێ کۆتایـی و بەبـێ سـەرکەوتن ..

هەرگیز .. وە بە بێ گەشتن بە هیچ بەرامبەرییەک ..

ژیـان بەرامبـەری و یەکسـانی نییـە لـە نێـوان بـوون و نەبوونـدا، بەڵکـو شـڵەژان و پێکدادانـە لـە نێوان هەردووکیانـدا .. زۆرانبازییەکە، جارێـک یەکێکیـان بـەرز دەکاتـەوە و جارێکیـش دەیـدات بـە زەویـدا

ژیان قەیران و پەشۆکانە ..

ئێمـە هەمـوو سـاتێک مـەرگ دەچێژیـن .. لـە مەرگـدا دەژیـن .. وە ناشـڵەژێین بەڵکـو بـە پێچەوانـەوە .. ئێمـە لـە میانـەی ئـەو مەرگـەی تیاماندایـە هەسـت بـە قـەوارەی خۆمـان دەکەیـن و .. بـراوەی خۆمـان دەبیـن و خۆمـان دەبەینـەوە و .. درکـی پـێ دەکەیـن و .. چێـژی لـێ وەردەگریـن ..

بەمەشـەوە ناوەسـتین .. بەڵکـو دەچینـە زۆرانبازییـەوە لەگـەڵ کۆمەڵگەکەمانـدا .. وە دەچینـە شـێوەیەکی تـرەوە لـە مـەرگ و ژیـان .. مـەرگ و ژیانێـک لـە بوارێکـی فراوانتـردا کـە کۆمەڵگـە و سیسـتم و پێکهاتـەی مرۆیـی گـەورە زۆرانبـازی تێـدا دەکـەن ..

لـە میانـەی ئـەم زۆرانبازییـە گەورەتـرەوە .. زیاتـر و زیاتـر هەسـت بـە خۆمـان دەکەیـن .. ئەمیـان چەنـد خانەیـەک نییـە لـە لەشـی تاکە کەسێکدا، لـە دایـک ببێـت و بمرێـت .. بەڵکـو چەنـد کۆمەڵەیەکـی مرۆییـە لـە جەسـتەی کـۆی کۆمەڵـگادا لـە دایـک دەبێـت و دەمرێـت ..

ئەمیان مەرگە و لە ئاستێکی گەورەتردا ڕوودەدات ..

کەواتە مەرگ ڕووداوێکی یەک لە دوای یەک و بەردەوامە ..

کاتێک مرۆڤ لەسەر دوو پێی وەستاوە، پەخەی دەگرێت و .. کۆمەڵگاکان لە تینی خۆیاندان، یەخەیان دەگرێت ..

ئەو لە شانە چنراوەکانی مرۆڤدایە .. لە جەستەیدایە .. لە هەریەک لە ترپەکانی دڵیدایە هەرچەندە بە تەندروستی و سەلامەتیشەوە ورژم بکات .. وە ژیان بە مردن پێک دێت و .. ئەو شێوەیە وەردەگرێت کە هەستی پێ دەکەین و تیایدا دەژین .. چونکە ئەوەی هەستی پێ دەکەین و تیایدا دەژین بەرهەمی هەردوو هێزەکەیە پێکەوە .. بوون و نەبوون کە بەڕاکێشان و کێش کردن، جێگۆڕکێ بە مرۆڤ دەکەن ..

کەواتە نهێنی ئەو سەرسامییە چییە تووشمان دەبێت کاتێک یەکێکمان لێ دەمرێت ..

بۆچی ئەم ئاخافتنەمان بەلاوە نا ژیرانەیە و .. جێگەی باوەڕپێکردن نییە ..

بۆچی لە بەردەم ڕووداوەکەدا سەرسامانە دەوەستین و چاوی خۆمان بەدرۆ دەخەینەوە و .. ئاوەزمان بە هەمان شێوە .. پاشان تێدەپەڕین و .. هەموو شتێکمان لە بیری خۆمان خستووەتە خوارەوە و چاومان لێ پۆشیوە و .. وامان داناوە ئەوەی کە ڕوویدا .. پێویست و فەرز بوو و .. زمان پاراویی و موجامەلەیەک بوو .. ئەنجاممان داو کۆتاییمان پێ هێنا ..

بۆچی ئەم ڕووداوە بە هەند وەرناگرین ..

وە بۆچـی لـە ترسـدا هەڵدەلەرزیـن کاتێـک بیـری لێدەکەینـەوە و .. دڵمـان لـە جـێ دەچێـت کاتێـک بـاوەڕی پێدەکەیـن و، کاتێـک ئەرزشـی بـۆ دادەنێیـن ژیانمـان دەشـڵەژێت ..

هـۆکار ئەوەیـە .. کـە ئەمـە تاکـە ڕووداوە ئێمـە ڕاسـتەخۆ دەیبینین ..چونکـە ئـەو ڕووداوی مەرگانـەی تیامانـدا ڕوو دەدەن ئێمـە نایـان بینیـن .. خڕۆکـە سـوورەکان نابینیـن کاتێـک لـە دایـک دەبـن و دەمـرن .. سـووتانی خانـەکان نابینیـن .. زۆرانبـازی میکرۆبـەکان نابینیـن کاتێـک دەمانکـوژن و دەیانکوژیـن ..

وە خانەکانمان لە ناوچوونی خۆیان نابینن ..

هەرچییـەک لـە ناومانـدا ڕوودەدات .. لـە تاریکیـدا ڕوودەدات .. ئێمـەش پـڕ بـە پێڵـوی چاوەکانمـان دەنویـن و دڵەکانمـان بـە ڕێـک و پێکـی لێـدەدات و هەناسـەدانمان بـە ئارامـی لەرەلـەر دەکات ..

مـەرگ هاوشـێوەی دز .. لـە ژێـر باڵـی تاریکایـی شـەودا، هەنگاوەکانمـان دەدزێـت .. بەسـەر سـەرماندا دەڕوات و مووەکانمـان بـۆ سـپی دەکات ..

تـاڵ .. تـاڵ .. بـە بـێ ئـەوەی هەسـت بکەیـن .. چونکـە تەپـەی ڕۆشـتنەکانی هەمـان تەپەکانـی ژیانـن ..

گەڵاکانـی درەخـت دەکەونـە خـوارەوە، بـەڵام درەختەکـە بـە ڕاوەسـتاوی و لار و لەنجەیـی لـە بەرچـاوان دەمێنیتـەوە و .. بەردەوام

سەوزی و بەردەوام گەشانەوە .. بەم شێوەیە دەمێنێتەوە تاکو زریانێک هەڵدەکات و لەڕەگەوە هەڵیدەکەنێت و فڕێی دەداتە سەر پانتایی ڕێگاکە ..

تەنها لەم کاتەدا ئیدی شێوەی لێل دەبێت و دەبێتە هۆی ڕەشبینی .. لقەکانی ڕووت دەبنەوە و .. ڕەگەکانی کلۆر و بۆگەن و .. گەڵاکانی زەرد هەڵدەگەڕێن ..

ئیدی تەواو بوو .. چیدی درەخت نییە .. بوو بە شتێکی دی .. بوو بە تەختە ..

هەر ئەمەشە ڕوودەدات .. کاتێک مرۆڤ دەبینین دەبێتە لاشەیەکی بێ گیان ..

ئیدی لە شتێکی دی دەچێت و ئەو ڕووداوەی کت و پڕ ڕوویدا، لە ڕووداوێکی سەیری بێ پێشەکی دەچێت ..

کت و پڕ هەموو مرۆڤەکە کۆتایی پێهات ..

جا ئاوەز دەست دەکات بە پرسیارکردن ..

ئایا منیش کت و پڕ هەمووم کۆتایی پێ دێت وەکو ئەو مرۆڤە .. چۆن .. لە کاتێکدا هیچ شتێک لە هەستەکانمدا هەرگیز ئامارە بەم کۆتاییە ناکەن ..

چۆن ئەمە ڕوودەدات .. لە کاتێکدا من لە جۆشی ئارەزوودام .. پڕم لە ئیرادە .. بەڵکو من خودی پڕ بوونم ..

چۆن پڕ بوون دەگۆڕێت بۆ بۆشایی و .. بۆ کەلێن ..

مـن .. مـن ؟ کـە هەمـوو دونیـام لـە خۆگرتـووە .. چـۆن ئـاوا کۆتاییـم پـێ دێـت و دەبـم بـە شـتێک دونیـا لـە خۆیـم بگرێـت ..

من ؟ ..

وشـەی مـن .. وشـەیەکی ئیلکتریکییـە .. وەکـو ڕووناکـی وایـە، هەمـوو شـتێکی پـێ دەبینـم و .. هیـچ شـتێک ناتوانێـت ئـەو ببینێـت ..

ئـەم وشـەیە لـە هەمـوو وشـەیەک گەورەتـرە و لـە هەمـوو حەقیقەتێـک گەورەتـر .. چونکـە بەمـەوە حەقیقەتـەکان دەبـن بـە حەقیقـەت ..

لـە سـەروو هەمـوو شـتێکەوەیە و تەنانـەت لـە سـەروو منیشـەوەیە، چونکـە دەمبینێـت و هەسـتم پـێ دەکات ..

سـەرچاوەی هەمـوو تیشـکدانەوەیە .. وە کاتێـک ئـەو دیمەنـە تراژیدییـەم بۆ وێنـا دەبێـت کـە مـرۆڤ مەیدانـی زۆرانبازییەکـەی تـێ فـڕێ دەدات، ئەو لە سـەروو ئـەو دیمەنە شـەوەیە .. چونکە دەبینێت و .. لـە سـەروو سروشـتەوەیە و .. لـە سـەروو یاسـاکانییەوەیە و .. لـە سـەروو دیاردەکانیشـییەوەیە ..

من مەرگم !

من کێم ..

وە ئەمە کێیە مردووە ..

ئەو بەشێکە لە من ..

دیمەنی ملیۆنەها ئەو دیمەنانەیە کە بە خەیاڵدا تێدەپەڕن ..

ئیدی چۆن منیش دەمرم ..

ئەوەنـدە ناخایەنێـت ئـەم پرسـیارکردنە دەگۆڕێـت بـۆ پارچـە پارچـە بوونێکـی سـامناک کـە تیایـدا لۆژیـک خـۆی تێـک دەشـکێنێت و .. دەکێشـێت بـە چەنـد مەحاڵێکـدا کـە چارەسـەریان نییـە ..

بەم شێوەیە کێشە ئەزەلییەکە دەست پێ دەکات ..

مەتەڵی مەرگ ..

سـەرچاوەی ئـەم مەتەڵـە، ئـەم هەڵوێسـتەیە کـە تیایـدا ئـاوەز لـە بینینـی ڕاسـتەخۆی مەرگـەوە دەچێت بۆ هەڵسـەنگاندنێکی ڕاسـتەخۆ دەربـارەی مەرگـی خـۆی .. لـە کاتێکـدا ئـەو خاوەنی هەموو شـتەکانە و .. هەمـوو سیسـتمەکانیان و .. ڕاڤـە و ڕووناکییەکانیـان ..

بەڵام دووبارە دەڵێت :

نا ..

ئەوە ئەوانی ترن دەمرن ..

هەموو مێژوو چیرۆکێکی مەرگی .. من .. ناگێڕێتەوە ..

بابەتـەکان دەگۆڕێـن و ئاڵوگـۆڕ دەبـن و دەوەرن و دەمـرن و ئەوانـی دی دەمـرن ..

مـن مـن .. ئـەم منـە .. لـە پێشـوودا یـەک نموونـەی لـێ نەمـردووە

مـن لـە ماددەیەکـی دیکـەم جیـاواز لـە هەمـوو ئـەم بابەتانـە .. هـەر بۆیـە دەیانگـرم و تاوتـوێ یـان دەکـەم و لێیـان دەگـەم .. بـەڵام ناتوانـم خـۆم بگـرم و تاوتوێـی بکـەم و لێـی تێبگـەم ..

مـن لـە سـەروو بەردەسـتی هەمووانـەوەم و .. لەسـەروو بەردەسـتەکانی خۆشـمەوەم و .. لەسـەروو بەردەسـتەکانی یاسـا و دیاردەکانـەوەم ..

ئەڵقەیەکی ون بوو هەیە ..

کـە دەرگایـەک دەکاتـەوە بـەرەو فەلسـەفە و .. فیکـر لێـوەی دزە دەکات .. بـەڵام دەرگایەکـی تەسـکە .. زۆر تەسـکە .. دەڕوات بـەرەو چەنـد ژێـر زەمینێـک کـە زۆربەیـان داخـراون و .. گەشـتی فیکـر لـەم ژێـر زەمینانـەدا ترسـناک و بێزارکـەرە، وەلـێ جێگـەی بایەخـە .. جـا چ شـتێک هێنـدەی ژیـان جێگـەی بایەخـە .. سـەرەنجام و .. لەکـوێ وە و .. بـۆ کـوێ و .. چـۆن ..

١ 



# پرۆسەیەکی قاچاغ

خۆشەویستی چیرۆکێکی جوانە .. مەرگ دانەرەکەیەتی ..

ژیان گەرمییە و .. سووتانە .. مەرگ چنراوییەتی و .. تیاچوون کرۆکییەتی ..

جەستەمان بەردەبێتەوە کاتێک ڕێ دەکات .. هەموو ساتێک شتێکی لێ دەکەوێتە خوارەوە ..

وە هەرچەندە بژین لە هەمانکاتدا ئەوەندەش دادەخورێت ..

نەبوون (عدم) .. لە بوونماندا شاردراوەتەوە .. لەجەستەماندا .. لە هەستەکانماندا ..

ترس .. گومان .. دوودڵی .. دڵەڕاوکێ .. تەمبەڵی .. پاڵ دانەوە .. بێ هیوایی .. لوتکەی بێ ئومێد بوون .. هەموو ئەمانە نیشانەی وەستان و هێمنین لە هەستەکاندا .. هەموویان هەستی نەبوونین , تاکە ڕاڤەیان ئەوەیە کە لە پێکهاتەی ئێمەد

ا کەلێنێک هەیە .. کەلێنێک بە چاوی هەستەکانمان دەیبینین .. جا دەترسین و نائارام دەبین و تووشی دڵەڕاوکێ دەبین ..

کەلێنێک لە ناخماندا چاوی تێدەبڕین ، گەرچی بە چاوی سەر نایبینین و .. تاکو پێمان نەوترێت فلان مرد .. بیرمان ناکەوێتەوە ..

مرد ..؟! چۆن مرد خۆ ئەو دوێنێ تا نیوەشەو لەگەڵماندا مایەوە .. شتێکی سەیرە ..

لێومان دەقرچێنین و .. پاشان هەموو شتێک لەبیر دەکەین و دەگەڕێینەوە سەر ژیانی ئۆتۆماتیکی خۆمان .. بەڵام چاوی ناوەکیمان هەر تەماشای ئەو کەلێنە دەکات و .. ناخمان بەردەوام لەم دڵەڕاوکێ تەم و مژاوییەدا هەڵدەلەرزێت ..

مەرگ بەلای هەریەکەمانەوە .. قەیران و .. پرسیارێکە .. مایەی سەرسامی و دڵەڕاوکێ و .. تۆقانە ..

بەڵام بەلای گەردوونەوە شتێکی دیکەیە ..

سەبارەت بە گەردوون .. پێویستی و شتێکی چاکە .. خێرێکە .. مەرگ و ژیان .. کاتێک لە دوورەوە تەماشایان دەکەین .. خەریکن لە گەردووندا کاردەکەن و وادەردەکەون کە واقیع دەئافرێنن ..

مـەرگ وەکـو تەواوکـەری ژیـان دەردەکەوێـت .. وەکـو ئـەو باخەوانـەی ڕووەکـە خـراپ بـووەکان هەڵدەکەنێـت و زەوییەکـە سـاف و تەخـت دەکات و دەیکێڵێـت تـا بـوار بـۆ تـۆوە بچووکـە ناسـکەکان بڕەخسـێنێت بەرهەمەکانیـان پێشـکەش بکـەن ..

وەکـو ئـەو وێنەکێشـەی بـە فڵچەکـەی هێڵێـک دەسـڕێتەوە تـا هێڵێکـی باشـتر لەسـەر تابلۆکـە بچەسـپێنێت ..

وەکـو دروسـتکارێک وایـە لـە پۆشـاکی ڕووخێنـەردا ..ئەوەتـا دیـواری جەسـتە دەڕوخێنێـت .. چونکـە لـە پشـت ئـەو دیـوارەوە ئـاوی ژیـان ڕێ دەکات ..

هەوڵبـدە وێنـای دونیـا بکەیـت بەبـێ مـەرگ .. دونیـا هـەر لـە ڕۆژانـی ئادەمـەوە .. بوونـەوەرەکان کەڵەکـە دەبـن و .. نامـرن .. خەڵـک و .. مێـش و .. بۆقـەکان و .. گژوگیـا وشـکەکان و .. کرمـەکان .. کەڵەکـە دەبـن و .. بەسـەر شـان و ملـی یەکدا دەکـەون .. تـا بـەری چـاوی خـۆر دەگـرن ..

ژیان دەبێتە شتێک هاوشێوەی خنکان ..

بوونـەوەری زینـدوو تەنهـا خـۆی خۆشـدەوێت .. لەگـەڵ ئـەو ساتە بچووکـەی تێیـدا دەژی ، بۆیـە ڕقـی لـە مەرگـە .. بـەڵام مـەرگ هەمـوو ساتەکانی خۆشـدەوێت .. کاتـی خۆشـدەوێت .. داهاتووشـی خۆشـدەوێت .. هەربۆیـە خەڵکـی وەکـو کەپـەک لـە بێژنگەکـەی دەکەونـە خـوارەوە .. تـا خەڵکانێکـی دیکـە لەسـەر لاشـەکانیان هەسـتنەوە و .. بـەم جـۆرە بـەردەوام دەبێـت ..

مـەرگ , پرۆسـەی مۆنتـاژ کردنـە کـە لەسـەر شـریتی هەمـوو بـوون کاردەکات و دەیبرێـت و دەیـکات بـە چەنـد دیمەنێکـی واقیعـی .. هەریەکەیـان تەمەنێکـی سـنووورداری هەیـە ..

هەروەهـا مـەرگ واقیعـی بێگانـەکان دەئافرێنێـت , هـەروەک چـۆن واقیعـی زینـدووەکان دەئافرێنێـت ..

بێگیانـەکان کۆتاییـان هەیـە .. چاویـش لەبـەر ئـەوەی کۆتاییـان هەیـە درکیـان پـێ دەکات .. کۆتایـی لـە درێـژی و پانـی و قووڵـی .. وە ئەگـەر بهاتایـە لـە درێـژی و پانـی و قووڵیـدا بـێ کۆتـا بوونایـە , وون دەبـوون .. وە دەچونـە سـەروو درک پـێ کردنـەوە ..

بوونیان نەدەما ..

ئەوە کۆتایی هاتنە , دەیانهێڵێتەوە ..

کۆتایی هاتنیش مەرگە ..

کەواتـە هەمـوو ئەوانـەی هـەن لە مرۆڤ و ئـاژەڵ و ڕووەک و بێگیان , هەموویـان کۆتایـی پێهاتـووی سـنووردارن .. مـەرگ لێوارەکانیـان دەخـوات و .. پەراوێزەکانیـان دەبڕێـت و .. دەریـان دەخـات و .. دەیانهێنێتـە بـوون و دروسـتیان دەکات لـە هەمـان کاتـدا ..

مـەرگ خێـر و چاکەیـە بـۆ گـەردوون چونکـە بەهۆیـەوە شـتەکان بوونیـان دەبێـت و بوونـەوەرەکان شـڵەژاوی هەسـت و ژیـان دەبـن ..

بەڵام بۆ تاکی مرۆڤ خراپترینی خراپەکانە .. بەلای تۆوە و .. بەلای منەوە .. چونکە وەکو باجی دامەزراندن و نۆژەنکردنەوە خەرجمان دەکات و .. لە قەسابخانەی بووندا وەکو قوربانی پێشکەشمان دەکات ..

وە ئێمە لەم جۆرە قوربانییە تێناگەین .. وە ناتوانین لێی تێبگەین چونکە قوربانییەکی سامناکە .. قوربانیدانێکە مانای مردن و تیاچوونی ئێمەیە .. ئێمە لە تراژیدیای خۆماندا دەژین .. مەرگیش وەکو کەلێنێک دەبینین کە دەمی بەژێر پێ ماندا دەکاتەوە و ئێمەش هەر شتێکمان دەست بکەوێت خۆمانی پێوە دەگرین و .. خۆمان بەخودی مەرگیشەوە دەگرین و خۆمان دەپارێزین لەو کەندەی لە ژێرماندا دەڕوخێت ..

وە ئافرەتەکە دەبینین هەردوو دەستی و دڵ و جەستەیمان بۆ درێژ دەکات و .. وەکو پردێکی مەلەوانکەری سەر ڕووباری لەناوچوون سەما دەکات .. ئێمەش هەڵپەی بۆ دەکەین تا ڕزگاری بکەین و .. هەست بە دێوانەیی چێژ و دڵخۆشی و خۆشی دەکەین کاتێک لە نێوان باڵەکانیداین .. هەست دەکەین دووبارە لە دایک دەبینەوە و .. زیندوو دەبینەوە و .. لە (میسر) هەڵدێین ..

وە دەمرین .. بەڵام پاش ئەوەی وێنەی خۆمان لەجەستەیدا ڕواند و قاچاغچییەتیمان بە بەشێک لەبوونی خۆمانەوە کرد لەڕێگەی ئەم پردە جوانە لەگۆشت و خوێنەوە .. کە بە زەردەخەنەکەی پێشکەشی کردین ..

خۆشەویستی .. هەمووی چیرۆکێکی جوانە .. دانەرەکەی ، خودی مەرگە .. بەتەنها خۆشەویستیش نا .. بەڵکو هەموو هەست و ترس و هیوا و وڕێنەکانی خەیاڵ و فیکر و هونەر و ڕەوشتەکان .. هەموو ئەم بەها مەزنانە قەرزاری مەرگن ، بۆ بوونیان ..

هەر نموونەیەکی ڕەوشتی دەتەوێت بۆم بهێنەرەوە .. منیش مەرگت لە دووتوێیدا بۆ ئاشکرا دەکەم ..

ئازایەتی .. نرخەکەی لەوەدایە ئاڵنگاری مەرگ دەکات ..

سووربوون .. بەهاکەی لەوەدایە ڕووبەڕووی مەرگ دەبێتەوە ..

بەم شێوەیە بۆ هەر نموونەیەکی ڕەوشتی .. هێزەکەی لەوەدایە ڕووبەڕووی بەرگری دەبێتەوە .. وە ئەگەر بەرگرییەک نەبێت ڕووبەڕووی ببێتەوە ، دادەڕمێت و .. ئەوەشی لە خۆی گرتووە دادەڕمێت ..

هونەرمەند و فەیلەسوف و پیاوی ئایینی سێ کەسن لەسەر دەروازەی مەرگ دەوەستن ..

فەیلەسوف هەوڵ دەدات ڕاڤەیەک بدۆزێتەوە ..

پیاوە ئایینییەکە هەوڵ دەدات ڕێگایەک بۆ ئارامی بدۆزێتەوە ..

هونەرمەندەکەش هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگایەک بۆ نەمری ، دەدات .. هەوڵ دەدات منداڵێکی ناشەرعی لەسەر ڕێگاکە جێ

بهێڵێـت , کەناوەکـەی بـە نەمـری بهێڵێتـەوە ..

پارچـە موزیکێـک یـا پەیکەرێـک یاخـود چیرۆکێـک یـا هۆنراوەیـەک

هەمووما .. مەرگ دروستمان دەکات .. مەرگی سەرسامکەر ..

گـەر نەمردینایـە هەسـتمان بـە خۆشەویسـتی نەدەکـرد .. چونکـە خۆشەویسـتی هیـچ نییەجگـە لەدەسـت گرتـن و هۆگربوون بـە ژیانەوە و .. هەوڵـدان بـۆ بەقاچـاغ بردنـی وەکـو مـاددە هۆشـبەرەکان لـە سـکی دایکـدا ..

هەروەهـا چ پێویسـت بـە ڕەوشـتەکان دەکات , لـە کۆمەڵـگای نەمرەکانـدا .. ڕەوشـت ئـەو کۆنکرێـت و ئاسـنەیە کـەماڵـە ڕووخاوەکانمانـی پـێ پاڵپشـت دەکەیـن .. وە هەیکەلـە لەناوچووەکانمانـی پـێ ڕادەگریـن .. جـا ئەگـەر ئێمـە هەمـوو لـە نەمـران بیـن و نەخـۆش نەکەویـن و نەمریـن و لاواز نەبیـن و تووشـی هیـچ خراپەیـەک نەبیـن , ئیـدی پێویسـتی ڕەوشـت لـە کوێدایـە ..

هەمـوو جـوان و چـاک و باشـەکانی کۆمەڵگاکانمان , لـەم کەلێنەوە دەردەچـن .. مەرگ ..

وە هەمـوو ئـەو جوانییانـەی لـە مرۆڤایەتیمانـدا هەیـە .. بەهەمـان شـێوە لـەم کەلێنـەوە دەردەچێـت .. ژیانمـان جیاکـراوە نییـە لەمەرگمـان .. بەڵکـو هەریەکەیـان مەرجـی ئـەوی تـرە ..

ڕاستتریش وایە بڵێین دوو حاڵەت نییە .. ژیان و مەرگ ..

بەڵکو یەک حاڵەت هەیە ئەویش خستنە گەڕە .. حاڵەتێکی دژیەکە لەناخی خۆیدا و هەردووکیانی پێکەوە لەخۆ گرتووە : ژیان و مەرگ ..

حاڵەتێکی جووڵاوی ترپە لێدەرە لەژیانەوە مەرگ دەخاتە گەڕ و لە مەرگەوە ژیان وە لە هەموو ساتێکدا هەردوو میکرۆبەکەی هەڵگرتووە .. میکرۆبی گەشە و میکرۆبی لەناوچوونی , لەهەمان کاتدا ..

ئەمانە دوو میکرۆبن ئاگربەستییان لە نێواندا نییە ..

یەکسانییان لە نێواندا نییە بەڵکو تەنها زۆرانبازی کردن و دڵەڕاوکێ و پارچە پارچە بوون و جۆرەها پریشکی فرۆکیان لە نێواندایە , هاوشێوەی پریشکە فرۆکەکانی دوو جەمسەری پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ کاتێک بەیەک دەگەن .. وەکو ئەو میکرۆبانەن .. گەرمی و رووناکی بڵاو دەکەنەوە ..ئەوانیش بریتین لەهەست و ئاگایی کە لە ئاوەزی ئەو مرۆڤەی لەم زۆرانبازییەدا دەژی بە نێگەتیڤ و پۆزەتیڤیەوە , دادەگیرسێنن ..

وا دەدەکەوێت لەم زۆرانبازییەدا توخمی پۆزەتیڤ بەهێزتر بێت لە نێگەتیڤ .. وە وا دەردەکەوێت ژیان زاڵ و سەرکەوتوو براوە بێت ..

ئەمانە قسەی جوانن بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ناتوانن مەرگمان لەبەرچاو جوان بکەن ..

تەنانـەت لـە پـۆزش هێنانەوەشـدا بـۆ (ئیزرائیـل) و کردەوەکانـی ، لای ئێمـە شکسـت دەهێنـن .. ئەگەرچـی لـە بەرژەوەندی گەدوونیشـدا بێـت .. جا گـەردوون بـە ئێمـە چـی ...ئێمـە خۆمـان گەردوونێکیـن و .. (ئیزرائیـل) هاتـووە پاکتریـن پیرۆزییەکانمـان ئەتـک دەکات، نەفسـمان .. مـن و .. تـۆ ..

جوانتریـن سـاتەکانی ژیانـم ئـەو سـاتانەن کـە تیایانـدا دەڵێـم .. مـن کـردم ..مـن پێشکەشـم کـرد .. مـن بەدەسـتم هێنـا .. مـن دامهێنـا .. مـن .. مـن ...

هیـچ شـتێک نییـە لـە بوونـی مـن .. یاخـود بوونـی تـۆدا .. بـە نرختربێـت لـەم وشـە بچوکـە .. مـن .. جا ئیـدی چۆن ئەکرێـت وێنا بکـەم کـە دەمـرم ..

منێـک کـە دەتوانـم مـردن بـەدی بێنـم .. دەتوانـم بکـوژم و خۆشـم بکـوژم ..

چۆن لـە کاتێکدا مـەرگ یەکێکـە لـە داهێنراوەکانـم ؟ مـن یەکێـک بـم لـە قوورباننییەکانـی ..

کوانـێ مەتەڵـە ڕاسـتەقینەکە .. ئایا مەرگـە .. یاخـود ئـەم وشـە بچوکەیانـە .. مـن ؟..







# من

لە ڕووکاری دەرەوەمدا سنوورم هەیە .. سەقفێکم هەیە، لەئاستیدا جەستەم کۆتایی دێت .. بەڵام لە ناوەوە بێ سەقفم و .. بێ بن ..

من .. وشەیەکی جوان و زەریفە .. لە دونیادا لەو جوانتر نییە .. گۆرانییەکە .. دەچێتە پێکهاتەی هەر ڕستەیەکەوە، دەیکات بە ڕستەیەکی تەواو و گرنگ .. دەچێتە هەر بابەتێکەوە، دەیکات بە بابەتی ڕۆژ ..

چونکە بابەت بۆیە بابەتی من و .. پارەی من و .. خۆشەویستی من و .. ڕوحی من و .. دڵی من ؟

بەڵام من ..؟ من کێم ..؟

ئایا کەستان هەوڵی داوە ئەم پرسیارە لە خۆی بکات ..

من کێم ؟

من فڵانم .. فڵان کێ .. فڵانی کوڕی فڵان .. ئەمە واتای چییە .. تەنها وشەی زارەکین .. تەنها چەند ئامارژە یا هێمایەکن ئامارژە بە حەقیقەتی من دەدەن .. باشە ئەی حەقیقەتی من چییە ؟

لێرەوە ئیدی مەتەڵەکە دەست پێ دەکات ..

حەقیقەتی من چییە ؟

من هەوڵدەدەم بوونی خۆم بگرم و بیهێنم پشکنینی بۆ بکەم هەروەک چۆن پشکنین بۆ ئەم مەرەکەبدانەی سەر مێزەکەم دەکەم .. دەبینم کە بوونێکی بێ بنە ..

بوونێک، لە ناوەوە بەسەر چەندین توانای بێ کۆتادا کراوەتەوە و .. کاتێک زیخ و بەرد فڕێ دەدەمە ناو ئەم بیرە ناوەکییەوە، گوێم لە هیچ دەنگێک نابێت .. چونکە هەر خلۆر دەبێتەوە و هەر خلۆر دەبێتەوە بۆ قوڵاییەکی بێ کۆتا ..

من لە ڕووکاری دەرەوەمدا سنوورم هەیە .. درێژی باڵام لە (١٧٠ سم) دا کۆتایی پێ دێت ..

سەقفێکم هەیە لە ئاستیدا جەستەم کۆتایی دێت .. بەڵام لە ناوەوە بێ سەقفم و بێ بن .. بەڵکو قوڵاییە و سەردەکێشێت بۆ قوڵایی .. وە بیر و وێنە و هەست و ئارەزووگەلێک کە تەواو نابن بۆ ئەوە نەبێت دووبارە دەست پێ بکەنەوە .. وەک بڵێیت پەیوەستن بە کانییەکی بێ کۆتاوە ..

وە قوڵاییەکان لە گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕی بەردەوامدان .. هەندێکیان لەسەر ڕووەکە سەر ئاو دەکەون و دەبنە کەسایەتیم و هەندێکی دیکەشیان لە تاریکیدا چاوەڕێی ڕۆڵی خۆیان دەکەن ..

من لە دەرەوەشمدا بەهەمان شێوە ئاڵوگۆڕ دەبم .. واقیع ئەم توێکڵەی لە دەرەوەمدا سەرکەوتووە دادەخورێنێت و توێکڵێکی نوێ لە ئاوەزی ناوەکیمەوە لە جێگەی ئەو سەرئاو دەخات ..

وە هەرکاتێک دۆخێک لە دۆخەکانم دەگرم و دەڵێم ئەمە منم .. ئەوەندە ناخایەنێت دۆخەکە لە ژێر دەستم دەردەچێت و دۆخێکی دیکە جێی دەگرێتەوە .. ئەویشیان .. هەر منم ..

شتێکی سەرلێشێوێنەرە !!!

وە سەیری جیهانی دەوروبەرم دەکەم .. دەبینم کە من لەم جیهانەدا مەلە دەکەم هەروەک چۆن مراوی لە ئاودا مەلە دەکات .. بە پەڕەکانی سەوڵ لێ دەدات و تەڕ نابێت بەڵکو بەسەر ئاوەکەدا دەخزێت وەک بڵێیت لە توخمێکی دیکەیە و نامۆیە ..

من پەیوەستم بە جیهانەوە و لەهەمانکاتدا لێی جودام .. جیهان دەچێتە پێکهاتەکەمەوە، بە حوکمی جێگەی نیشتەجێبوون و خواردن و خواردنەوە و پەیوەندیم لەگەڵ کەسانی تردا .. بەڵام پێمەوە نەلکاوە .. ئەو تەنها هەستەکانم دەوروژێنێت و جێگەی بایەخمە .. وە بە ئەندازەی بایەخەکەم پەیوەندیم لەگەڵیدا دەمێنێت و .. کاتێک گرنگیدانم پێی کۆتایی دێت، لە خۆمی دەکەمەوە هەروەک چۆن کاتێک مراوی دەگاتە کەنار، خۆی

دەلەرزێنێت و ئاوەکە لە پەڕەکانی دەکاتەوە ..

من بە هەڵبژاردنی خۆم جیهان لە باوەش دەگرم و گرنگی پێدان و کەسایەتی خۆمی بۆ دادەنێم و لە خۆمی دەگرم و هاوڕێیەتی دەکەم تا ئەو کاتەی ئەو .. من، دەبێت .. وەلێ کاتێک ئەم پەیوەندییە (من) بیە کۆتایی هات .. دەگەڕێمەوە بۆ خۆم ..

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا من ڕزگارم نابێت لە چەپەڵی و .. نزم بوونەوە و ئابڕووچوون لە چاڵەکانی خەڵکیدا ..

هەندێک جار جیهان هەراسانم دەکات و بۆ ماوەیەک تیایدا دەتوێمەوە .. ئەو داواکارییەی سەرنووسەری ئەو گۆڤارەی کاری لەگەڵدا دەکەم داوای دەکات، بۆی جێبەجێ دەکەم و .. ئەو کارانەی بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکەم کە وەکو پزیشکێک کاری تێدا دەکەم، داوام لێدەکات، بەئەنجامیان دەگەیەنم ..

ملکەچی ڕۆتینی داب و نەریت و موجامەلەکان دەبم و .. خۆم لە چەنەبازیدا خەسار دەکەم و لە پشت کێشەکانی ڕۆژانەوە خۆم حەشار دەدەم .. وە لە پشت خەڵکەوە خۆم دەشارمەوە و .. دەڵێم جا من چی بکەم .. ئەوان ئەوەیان لە من دەوێت .. دونیا هەمووی هەروا دەکات ..

لەم جۆرە کاتانەدا خۆم لە دەست دەچێت .. لە دەستم دەچێت .. وە دەبمە بابەتێک هاوشێوەی بابەتەکانی کورسی و درەخت و پەرتووک و .. ئەو شتە پاکیزەیەی لە هەمووانم

جیا دەکاتەوە، لە دەست دەدەم .. ئەو شتەی کە دەمکات بە چنراوێکی تاک .. دەمکات بە .. من .. فلانی کوڕی فلان ..

ئەمانە چەند کاتێکن من هەستیان پێ ناکەم .. بەڵکو لە سڕاوە و هێڵ بەسەردا هێنراو دەچێت ..

ئازادییەکەم ئەشکەنجەم دەدات .. چونکە کاتێک هەڵدەبژێرم .. دەبمە دیلی کۆت و بەندی هەڵبژاردنەکەم .. وە ئازادییەکەم دەگۆڕێت بۆ کۆیلایەتی و بەرپرسیاریەتی .. بەرپرسیارییەتییەک کە چاوپۆشی کردن لێی دەست نادات، چونکە بەرپرسیارییەتییەکە بەرامبەر بە خۆم .. بەرامبەر بەو هەڵبژاردنەی کە من هەڵمبژاردووە ..

هیچ ڕێگایەکم لە بەردەمدا نییە، جگە لەوەی هەڵبژێرم .. لە هەموو ساتێکدا هەر دەبێت هەڵبژێرم .. جا خۆ گەر مانم گرت لە هەڵبژاردن .. ئەوا خودی مانگرتنەکەشم جۆرێک دەبێت لە هەڵبژاردن .. دەبێت دەستبەجێ باجێک بدەم ..

وە خۆشەویستییەکەم ئەشکەنجەم دەدات چونکە من دەمەوێت خاوەنی خۆشەویستەکەم بم و لەناو خۆمدا بیتوێنمەوە و کەسایەتی و ڕوح و جەستەی هەڵقوڕێنم .. دەمەوێت بیگۆڕم بۆ .. من .. کە ئەمەش ئەستەمە .. چونکە ئەویش بۆ خۆی .. (من) ی خۆی هەیە و .. خودێکی وەکو من ئازادە ..

هەموو ئەوەی دەتوانین بیکەین ئەوەیە یەکدی لە باوەش بگرین و .. ڕاستی و نهێنییەکانمان لە چەند ساتێکی درەوشاوەدا

بەریەککەوتنیـان هەبێـت .. پاشـان هەریـەک دەڕۆیـن بـە لای خۆمانــەوە .. هەریــەک بــە ســەر نهێنییەکــەی خۆیــدا داخــراوە ..

هەمــوو ئــەوەی خاوەنیــن ئەوەیــە کــە پەنجەرەکانمــان بەســەر دەرەوەدا بکەینــەوە، بــەڵام ناتوانیــن شــت و مەکەکانــی نــاوی بگوازینــەوە و ..

لە ماڵێکی نوێ دا نیشتەجێ بین ..

ڕوحمان ڕازە .. وە خودمان پیرۆزترینی پیرۆزییەکانە ..

هــەروەک (طاغــور) دەڵێــت خــودا هەمــوو ســەربازەکانی لەبــەر دەرگای خودی ئێمـە دادەنێت و .. ڕێگـە بـە کەسیان نـادات بچنـە ژوورەوە ..

چونکــە پیــرۆزە .. لــە هەموانــی قەدەغــە کــردووە و .. وەکــو باڵــداری ئــاواز چــڕ .. ئــازاد دروســتی کــردووە ..

چی لەوێیە .. چی لە پشت دەرگاکەوەیە ..

چی لەناو مندایە ..

ویسـت .. ویسـتێکی ناکۆتا کە هیچ سنورێکی نییە خۆی نەبێت .. ویسـتێکی ئـازادی ئافرێنـەری داهێنـەر .. هەڵدەقوڵێـت لـە پێشـەنگی و فیترەتـدا .. هەسـتی پێدەکـەم و نایناسـم .. تێکەڵـی دەبـم و لێـی تێناگـەم .. چونکـە هــەرکات هــەوڵ بـدەم لێـی تێبگـەم لەدەسـتم دەردەچێـت، هــەروەک چۆن خــەو لــە چاوم دەتۆرێـت کاتێـک هــەوڵ

دەدەم لێی قوڵ ببمەوە و شی بکەمەوە .. ڕەنگە هۆکارەکەی ئەوە بێت کە ڕەسەنە .. لە ئاوەز و بیرکردنەوە ڕەسەن ترە و ناکرێت ببێتە بابەتێک بۆیان .. بەڵکو پێچەوانەکەی قبوڵکراوە .. کە ئاوەز بابەت و خزمەتکاری ویست بێت .. وە ڕێگایەک بێت بۆ گەشتن بە ئامانجەکانی ..

من شتێکم دەوێت و .. ئاوەزیش پاساوی ویستنی ئەو شتەم بۆ دەهێنێتەوە .. نەک پێچەوانەکەی هەرگیز ..

هەموو شتێک ملکەچی ویستە و .. بەراورد پێی شتێکی لاوەکییە ..

لە ساتەکانی داهێنان و ئافراندنمدا .. لەو ساتانەدا کە هەست دەکەم خۆم بەدی دەهێنم .. بیر و بەهاکان بەدی دەهێنم و .. جیهان دەدۆزمەوە و شتی ژیرانە بە ئەنجام دەگەیەنم، هەست دەکەم هەموو جیهان لە پێش خۆمەوە پاڵ دەنێم .. وەکو عارەبانەیەک پاڵی دەنێم ..

وە لەو ساتانەی کە تێیدا دەمرم و دەکەومەوە ناو چاڵی عادەت و دووبارەبوونەوە و لاسایی کردنەوە و موجامەلە و ڕۆتینەوە و .. ویستەکەم لە کیس دەچێت .. هەست دەکەم ئەمجارە جیهان من وەکو عارەبانەیەک پێش خۆی دەخات و پاڵم پێوە دەنێت ..

هەست دەکەم ویستی ئەسپێکی سەر ڕێگاکە دەتوانێت ڕێکخستن لە ڕێگاکەمدا بکات و ڕێڕەوەکەم بگۆڕێت ..

هەست دەکەم چاوی دراوسێکەم وام لێدەکات لە جلەکانی خۆمدا بچمەوە یەک .. هەروەک بلێی چاوی خودایە ..

لە دونیادا هیچ شتێک لە ویست و ئیرادە گەورەتر نییە ..

بارودۆخی دارایی و ژینگەیی و بۆماوەیی .. هەرگیز ویست هەڵناوەشێننەوە و ئازادی ناسڕنەوە .. وەلێ کاری لێ دەکەن .. کاریگەری دەکەنە سەر چۆنیەتی ڕاگەیاندن و گوزارشت کردنی لە خۆی ..

من و بارودۆخ تەنها لە ساتی کاردا زۆرانبازی دەکەین .. بەڵام هەریەکەمان بوونی پاکیزەی خۆی هەیە ..

من ئازادم و .. ویستیشم ڕاستەقینەیە .. هەروەک چۆن کە بارودۆخ بوونی هەیە و ڕاستەقینەیە ..

بەڵام ویست چییە ؟

وشەیەک نییە وەسفی بکات یاخود ڕوونی بکاتەوە .. چونکە لە هەموو وشەکان گەورەترە و هەموو وشەکان لە خۆدەگرێت و بەسەریشیاندا هەنگاو دەنێت .. بۆیە هەموو وەسفکردنێکی کەم و کورت دەردەچێت .. ئەو وەکو تامەزرۆیی وایە وەسف ناکرێت بەڵکو ئەزمون دەکرێت و تێکەڵی لەگەڵدا دەکرێت ..

ویست .. قسەکەی ( ابو البركات البغدادی) , سۆفی و پیاو چاکی بەسەردا دەچەسپێت کە دەڵێت :

_ لەهەموو دیارێک دیارتر و لەهەموو نادیارێک نادیارتر ..

باشترین ڕێگە بۆ ناسینی ئەوەیە پراکتیزەی بکەیت .. چونکە ئەو کلیلە جادوییەیە کە دەتوانێت هەموو گەردوونی پێ بکەیتەوە ..

بەڵام پرسیار گەلێک دێن بە خەیاڵماندا ..

ئایا ویست بوونی هەیە لە کاتدا ..

ئایا وەکو دڵ لێدەدات ..

وەکو جەستە گەشە دەکات ..

ئایا وەکو ساتەکان بەدوای یەکدا دێت و .. وەکو بارە دەروونییەکان تێدەپەڕێت ..

ئایا وەکو ڕووناکی و کارەبا جووڵە دەکات و وەکو وزەی گەرمی دەگوێزرێتەوە ..

ئەمانە پرسیارگەلێکن دەرگای کێشەیەکی دیکەشمان بۆ دەکەنەوە ..

کات ..

کات چییە ؟

ئایا جووڵەی میلی چرکە و خولەک و کاتژمێرەکانە ؟ ..

چرکەی کاتژمێرەکەی زانکۆیە ؟

ئەو ژمارە گشتییانەیە کە دەزگاکانی چاودێری بڵاوی دەکەنەوە، دەربارەی کاتی شەو و ڕۆژ و کاتژمێرەکانی نیوەڕۆ و شێوان و خەوتنان ..

یاخود کاتێکی دیکەی تایبەتە، هەریەک لە ئێمە لە ناخی خۆیدا تیایدا دەژی و بوونی خۆی لەسەر ڕێک دەخات ..

ئێمە بەم پرسیارانەمان دەگەینە ئەو خاڵەی کە تێیدا ئیدی تەم و مژ زۆر دەبێت و بینین سەخت دەبێت ..

هەڵمان دەگرێت بۆ خوارەوە ..

لە گەڵاکانەوە دامان دەبەزێنێت بۆ قەد و ڕەگەکان ..

بۆ ژێر دارەکە و ژێر نیانی درەختەکە .. بۆ ئەو شلەیەی بە ڕووەکەکاندا سەر دەکەوێت و ژیانی تێدا بڵاو دەکاتەوە ..

ئێمە دەست لە توێکاری دەست و قاچ هەڵدەگرین و دەست دەکەین بە گەڕان بە دوای خودی جووڵەدا .. وە واز دەهێنین لە پێوانەکردنی هێزی ماسولکەکان تا لە دوی خودی ویست بگەڕێین .. چونکە ئێمە لە ژووری بزوێنەرەکەین کە بۆری سوتاندنە و هەموو وزەکە بڵاو دەکاتەوە ..

وە لە وێدا بیرۆکە و بیردۆز و ڕێبازەکان لە تاریکیدا، پێکدادەکێشن ..

 



# کات

چرکەکانی کاتژمێری دیوارەکە کاتێکی ساختەت پێشکەش دەکەن .. لە لێدانەکانی دڵتدا بۆ کاتی ڕاستەقینەت بگەڕێ .. لە ترپەکانی هەستتدا ..

هەموو شتێک لە دونیادا ڕادەکات و هەناسە بڕکێیەتی .. خۆر هەڵدێت و ئاوا دەبێت ..

ئەستێرەکان لە خولگەکانیاندا دەخولێنەوە ..

زەوی بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە ..

(با) بەهەر چوارلادا هەڵدەکات ..

لافاوەکان لە لوتکەی چیاکانەوە بە خوڕ دێنە خوارەوە و ..

سەرچاوە و کانییەکان لە ناخی زەوییەوە هەڵدەقوڵێن .. ڕووەک و ئاژەڵ و مرۆڤ هەموو لە جوڵەیەکی بەردەوامدا دەژین ..

گەردیلەی بێگیانەکانیش لە خولگەکانی خۆیاندا هەروەلە دەکەن ..

وە هەموو دیاردە سروشتییەکان هەر بریتین لە جووڵە .. کارەبا جووڵەیە و .. دەنگ جووڵەیە و ڕووناکی جووڵەیە و .. گەرمی جووڵەیە و .. کۆی گەردوون وەکو بڵقێکی سابوون فراوان دەبێت و دەتەقێت، لە هەر نیوەتیرەیەکی بۆشاییدا .. ماددە لە دۆخێکی بڵاوبوونەوە و لەرەلەر و جووڵەدایە، هەربۆیە ئەنیشتاین دەڵێت کە جگە لە سێ ڕەهەندە زانراوەکە، ڕەهەندی چوارەمیش هەیە .. یاخود کاتی لکاو بە شوێنەوە کە پێی دەڵێت ( کات – شوێن )[1] ..

ماددە وەکو گیانلەبەر درێژی و پانی و ئەستووری و تەمەنی هەیە ..

تەمەنیش دەچێتە پێکهاتەیەوە هەروەک چۆن دەچێتە پێکهاتەی گیانلەبەرەوە .. کات یەکێکە لەو پڵێتانەی کە چنراوی ماددەی لێپێکدێت ..هەروەک یەکێکە لەو پڵێتانەی کە بوونەوەری زیندووی لێ پێک دێت ..

***

---

[1]) کات – شوێن : الزمکان ( الزمان + المکان )

بەڵام کات چییە ..

ئایا چرکەکانی کاتژمێری زانکۆیە .. ئەنجامە هەڵواسراوەکانی دیوارەکە و ساڵنامە فەلەکیەکانی وەرز و ڕۆژەکانە ؟

ئێمە هێشتا وشەکانی چاودێرەکەمان لەبیرە کاتێک خەریک بووین تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵمان ئەنجام دەدا ..

_ نیو کاتژمێر کات ماوە ..

ئەو لەرزەمان بیرە دەیگرتین کاتێک تەماشای کاغەزی پرسیارەکان و تێنوسی وەڵامەکانی خۆمان و کاتژمێری دەستی چاودێرەکەمان دەکرد .. تەماشای لێویمان دەکرد کە دەی وت :

نیو کاتژمێر کات ماوە ..

وەک بڵێیت بڕیاری لە سێدارەدانێک ڕادەگەیەنێت .. یاخود بڕیارێکی ئازاد بوون لە زیندان ..

ئەو نیو کاتژمێرە لای هەندێکیان زۆر کورت بوو .. لە نیو خولەک کورت تر .. چونکە تێنوسی وەڵامەکانی بەردەمی هێشتا سپی بوو .. وە هێشتا بۆ وەڵام دەگەڕا و سەری دەخوراند .. لای هەندێکی تریشیان زۆر درێژ و بێزارکەر بوو ..درێژتر لە نیو ڕۆژ .. چونکە تەواو بووبوو لە وەڵامدانەوە ..

کات ژمێری دەستی چاودێرەکە ئاماژەی بەیەک کات دەکرد ..

بەڵام هەریەک لە ئێمە کاتێکی تایبەت بە خۆی هەیە ..

دەڵێیت پێوەری کات لای هەریەکەمان جیاوازە لەوی دی ..

ئەمەش کلیلی مەتەڵەکەیە ..

کات شتێکی دابڕێنراو نییە لە ئێمە، وەکو دار و مەرەکەبدان و پەرتووک .. زەمبەلەکێک[٢] نییە لە کاتژمێری مەچەکدا .. بەڵکو شتێکە وەکو جل لەبەرمان دەکات ..

هەریەکەمان کاتی تایبەت بە خۆی هەیە ..

هەستەکان و بایەخ پێدراوەکانمان کاتژمێری ڕاستەقینەن کە کاتەکانمان ڕێک دەخەن و درێژی دەکەنەوە و کورتی دەکەنەوە ..

خۆشییەکانمان کاتژمێرەکانمان دەکەن بە چرکە سات و .. ئازارەکانیش چرکە ساتەکانمان درێژ و تاڵ و قورس وەکو ساڵ لێ دەکەن و .. درێژتریش ..

سەرچاوەی هەست کردنمان بە خێرایی و هێواشی کات، کاتژمێری دیوارەکە نییە، بەڵکو سەرچاوە ڕاستەقینەکەی هەستی ناوەکیمانە ..

کاتژمێری دیوارەکە کاتێکی ساختەمان پێشکەش دەکات .. بەهەمان شێوە بۆ ساڵنامەی فەلەکیش کە ژیانمان دابەش دەکات بۆ ڕۆژ و مانگ و وەرزەکان، مێژووش کە ژیانمان بۆ ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو دابەش دەکات .. چونکە ژیانی ئێمە قابیلی

٢)) زەمبەلەک : ئەو دوگمەیەیە کە لە کاتژمێری دەستدا هەیە بۆ ڕێکخستنی کاتەکە بەکار دێت ..

دابـەش کـردن نییـە ..

ژیانـی ئێمـە سـاتێکی دوور و درێـژی بەردەوامـە هاوشـان لەگـەڵ هەسـتێکی بـەردەوام بـە ئامادەگـی .. وە ئێمـە لـە ڕێگـەی ئێسـتاوە ڕابـردوو دەناسـین ..

کاتێـک لـە هەسـتی بیرکەوتنـەوەدا دەژیـن نـاوی دەنێیـن ڕابـردوو .. وە کاتێـک لـە هەسـتی پێشـبینی کردنـدا دەژیـن نـاوی لـێ دەنێیـن داهاتـوو .. بـەڵام هەمـوو ئـەم هەسـتانە ئێسـتان .. وە مەوداکانـی نێـوان ڕابـردوو و ئێسـتا و داهاتـوو چەنـد مەودایەکـی ئەندێشـەیین .. چونکـە ئـەم سـێ سـاتە دەچـن بـە نـاو یەکـدا هـەروەک چـۆن شـەو و ڕۆژ لـە ئاسـۆدا دەچـن بەنـاو یەکـدا ..

وە ئـەوەی هەڵدەسـتێت بـە دەسـت نیشـانکردنی سـات لـە هەسـتدا بریتییـە لـە ئاگاداربوونـەوە ..

ئاگاداربوونـەوە هێڵێـک بـە ژێـر بەشـێک لـە هەسـتەکانماندا دەهێنێـت بۆیـە وا هەسـت دەکەیـن سـاتێک وەسـتاین، بـەڵام ڕاسـتی ئەوەیـە کـە هەرگیـز وەسـتان نییـە .. بەڵکـو ئێمـە لـە بارێکـی وورۆمکردنـی ناوەکـی بەردەوامـدا دەژیـن .. بـۆ هەتـا هەتایـە ..

کاتـی دەرەکیـش .. کاتـی کاتژمێـر و وریاکـەرەوەکان، کاتێکـی درۆزن و هەڵخەڵەتێنـەرە چونکـە سـاتەکان یەکسـان دەکات دەیانـکات بـە چەنـد ژمارەیـەک لەسـەر مینـا و ڕووکەشـی کاتژمێرێـک ..

کاتژمێـر یـەک .. کاتژمێـر دوو .. کاتژمێر سـێ .. تەنها جووڵەیەکی میلەکەیـە .. وە گواسـتنەوەیەکی چەنـد سـانتیمەتری لەسـەر مینـای

کاتژمێرەکە .. ئەوە کات نییە .. بەڵکو چەند بارودۆخێکی جیاوازی شوێنە .. وەلێ کاتی ڕاستەقینە لە ناخی ئێمەدایە .. ئەویش شڵەژاوییەکی بەردەوامە کە هیچ ساتێک تێیدا یەکسان نابێت بە ساتێکی دی .. ساتێکی بچووک و .. ساتێکی گەورە و .. ساتێکی هیچ ..

وە قابیلی دووبارە بوونەوە نییە .. چونکە هەر ساتێک لەگەڵ ئێستادا، هەموو ڕابردووشی لە خۆ گرتووە .. وە هەموو ساتێک فرەیەکی نوێ لە ئەزموون و ژیان زیاد دەکرێت و ئیدی ژیان قابیلی دووبارە بوونەوە نابێت .. بەڵکو ئەوە تێڕوانینە .. لە کاتێکدا ئەو کەسەی لە دەرەوە تەماشامان دەکات پێویستی بەوەیە بە چاوی سەر جووڵەی باڵەکانمان ببینێت و دوای بکەوێت و بە ئاوەزی شی بکاتەوە تا پێمان بڵێت کە ئێمە خەریکین دەستمان بۆ سەرەوە بەرز دەکەینەوە ..

زانینی ئێمە لەسەروو زانینی ئەوەوەیە، چونکە ئێمە ڕاستەوخۆ حەقیقەتەکە دەست نیشان دەکەین ..

بەم زانینەش کاتمان دۆزییەوە .. کاتی ڕاستەقینەمان .. بەلام هەموو کاتێک لە کاتی ڕاستەقینەدا ناژین چونکە هەموو کاتێک لە ناخی خۆماندا ناژین .. بەڵکو لە کۆمەڵگایەکدا دەژین .. دەچینە دەرەوە و تێکەڵی خەڵک دەبین و سوود ئاڵوگۆڕ دەکەین و قسە دەکەین و وەردەگرین و دەبەخشین ..

بۆیە دەرچەیەکمان لە ملکەچی کاتەکەی دیکە بۆ نییە .. کاتی کاتژمێرەکان .. دەبینە کۆت و بەندی وادەکان و پەیوەستی

شـوێنەكان دەبيـن .. وە بـەدواى خاڵـە هاوبەشـەكانى نێوانمانـدا دەگەڕێيـن تـا لەيەكدى تێبگەيـن .. وە لـە ميانـەى گـەڕان بـە دواى خاڵـە هاوبەشـەكاندا، خاڵـە ڕەسـەنەكانمان لـە كيـس دەچێـت .. داب و نەريـت و بيرۆكـە ئامـادەكان، شـتە داهێنـراوەكان و ئـەو خـودە قوڵـەى حەقيقـەت و ڕازەكانمـان لـە خـۆ دەگرێـت، دەشـارنەوە ..

جـا بـە ناخێكـى قـەرز كـراو لـە داب و نەريتـەوە دەچينـە نـاو كـۆڕى خەڵكـەوە، تـا بـە دڵـى ئـەوان بيـن ..

وە بـە تێپەڕبوونـى كات خودێكـى كۆمەڵايەتيمـان بـۆ دروسـت دەبێـت كـە بـە بيرێكـى ئامادەكـراو و خـوو گەلێكـى بـۆ ماوەيـى و ئارەزووانێكـى گشـتى نـەك كەسـييەوە دەژيـن ..

ئەمـەش خودێكـى ڕووكەشـانە و چەنەبـازە .. كاتەكانـى بـە سەرەخۆشـى كـردن و پيرۆزبايـى كـردن و موجامەلـە و جەژنـە پيرۆزەكـردن و لـە پڕوپوچيـدا بەسـەر دەبـات و ژيانـى لـە كۆمەڵێـك پەيوەنـدى ڕووكەشـييانەدا خـەرج دەكات كـە لـە هۆكارەكانـى گواسـتنەوەى مـاددى دەچێـت .. لـە دەرگايەكـەوە دەگەيەنێـت بـە دەرگايەكـى دى بـەڵام لـە دڵێكـەوە ناگەيەنێـت بـە دڵێكـى دى ..

ئـەم خـودە هيچـە جيايـە لـەو خـودە قووڵـەى لـە كاتژمێرەكانـى تەنهاييمانـدا دەچينـە قووڵاييـەوە و تيايـدا خۆمـان دەدۆزينـەوە و ڕووە ڕاسـتەقينەكانى خۆمـان بـۆ دەردەكەوێـت ..

ئـەم خـودە هيچـە بێگيانـە وەكـو جەسـتە، ئـارەزوو و پێداويسـتە كۆمەڵايەتييـەكان كۆنترۆڵـى دەكـەن ..

وە لـە پێشـاوی[٢] دەروونـی دەچێـت .. تەمبەڵـی و دڵ تەنگـی و بێـزاری خۆمانـی تێـدا بەتـاڵ دەکەینـەوە و کاتەکانـی خۆمانـی تێـدا بـە چەنـد سـەرقاڵییەکی بێ بەهـا دەکوژیـن .. سـەرقاڵی پڕوپوچـی وەکـو چـەرەس قرتانـدن و یـاری تاوڵـە .. وە لـە ژیانمانـدا لـە نێـوان ئـەو خـودە ڕووکەشـە و ئـەم خـوودە قووڵـەدا جۆلانـی دەکەیـن .. جارێـک بـەرز دەبینـەوە و جارێـک نـزم .. بـۆ ماوەیەکـی درێـژ لەکاتی کاتژمێرەکانـدا دەژیـن، لەچەنـد کار و فەرمانبەرییەکـی ئۆتۆماتیکـی ڕۆتینـی دا .. وە لـە چەنـد سـاتێکی کەمـی بـەرزی ناخمانـدا، لـە کاتـی حەقیقـی زیندوومانـدا دەژیـن، جـا بـە مەسـتی دەلەرزیـن و تیشـکی بەختـەوەری دەدەینـەوە و بـە دڵەڕاوکێـوە هەڵدەلەرزیـن و پـڕ دەبیـن لـە فزوڵیـک و زانخـوازی و چێـژ و .. حەقیقەتـی ناخـی خۆمـان و پاکیزەییەکـەی دەزانیـن ..

ئێمـە ئـەم ناخـە پاکیزانەمـان لـە چەنـد سەرکێشـییەکی کەمـدا بـۆ دەردەکەوێـت ..

بۆ یەکەم جار لە سەرکێشی خۆشەویستیدا دەیدۆزینەوە ..

کاتێـک ئـەوە ئافرەتـە دەدۆزینـەوە کـە بوونمـان دەهەژێنێـت و .. پیامانـدا تێدەپەڕێـت و سـنووری کلتـور و بیرکردنـەوە و ژیانمـان دەبڕێـت و سـەرەو ژێـری دەکاتـەوە .. وەک بڵێیـت ژیانێکـی نـوێ ی سـەیرە ..

بـۆ جـاری دووەم لـە سەرکێشـی هونـەردا دەیدۆزینەوە .. لەو سـاتی ئیلهامـەدا کـە هەسـتمان بەسـەر درک پێکردنێکـی نـوێ دا دەکرێتـەوە

---

پێشاو : تەوالێت .

و بە شێوەیەکی نوێ وێنای دوونیا دەکەین .. بۆیە دەنووسین یا گۆرانی دەڵێین یا وێنە دەکێشین یاخود هۆنراوەیەک دەڵێین ..

جاری سێیەم لە سەرکێشی بیرکردنەوە و هەستکردنی قوڵ بە ئاییندارییدا دەیدۆزینەوە .. لە ساتی پەردەلادرانی فیکری و سۆفییانە کە تیایدا دەست دەخەینە سەر حەقیقەتێکی ڕاستەقینەی ناو خۆمان یاخود خەڵکی دەوروبەرمان یاخود دونیا

جاری چوارەمیش لە کاردا دەیدۆزینەوە .. لە ساتی داهێناندا کە نهێنییەکی سروشت دەدۆزینەوە و سەرسامان دەکات و تووشی شۆکمان دەکات ..

هەموو ئەم دۆزینەوانە لە کاتی دووبارەبوونەوە و بێ بایەخ بوون دەرمان دەکات .. کاتی کاتژمێرەکان .. وە دامان دەبەزێنێت بۆ قوڵاییەکانمان .. بۆ کاتی ڕاستەقینەمان کە هەموو شتێک نوێ و داهێنەرانەیە .. سەرسوڕهێنەر و جوان و .. هۆکاری ئەوپەڕی چێژ .. فزوڵی و زانخوازی ..



## خۆشەویستی

ئارەزوو جۆر و نێرییەتیت بۆ دەردەخات و ..

خۆشەویستی نەفس و خودت بۆ دەردەخات ..

بێزاربوونیش لەو دووانە ئەو نامە ئاگادارکەرەوە شاراوەیەیە کە دەستت دەگرێت بۆلای خۆشەویستە ڕاستەقینەکەت ..

خۆشمەوێی ..

وشەیەکی بە چێژە و تووشی سرِی و سەرگێژەمان دەکات .. کاتێک ئەم وشەیە گۆ دەکەین .. هەموو شتێک تیاماندا دەتوێتەوە و شی دەبێتەوە تەنانەت خودی زمانیش دەتوێتەوە و ئاوەز دەتوێتەوە و دڵ دەتوێتەوە ..

لە ساتی خۆشەویستیدا زمان لەکار دەکەوێت و بێدەنگییەکی پڕ لە قسە و واتادار جێگەی دەگرێتەوە .. شوێن و کات لە بێهۆشییەکی بە ئاگادا لەناو دەچن، کە تیایدا ساتەکان چیدی

وازدەهێنن لەنزم بوونەوە و لە هەستکردن بە مەستی و لە سەرکەوتن و دڵخۆشیدا دەتوێنەوە .. لەوانەیە ئەم مەستییە یەک سات بێت .. بەڵام ئەم ساتە دەبێتە هەتا هەتایە ..

خۆشەویستی دەیکات بە هەتا هەتایی بۆیە لەبەردەم هەستتدا بە لاری بەردەوام دەبێت .. لە داهاتووشدا بۆ چەندین ساڵی دوور و درێژ بەردەوام دەبێت و بەدوی خاوەنەکەی دەکەوێت و ئیدی سێبەرێکی درێژی لەسەر ژیانی داناوە .. تێکەڵی ئاگایی و خەو و خەون و ورێنەکانی بووە و .. لەناخەوە پێوەی لکاوە و ئیدی ئەستەمە لەگەڵ چەنەبازییەکانی رۆژانە و سەرقاڵی و پڕوپوچییەکانیدا هەڵی رێژێت .. بووە بە بەشێک لە خۆی .. دەژی بە ژیانی و .. دەمرێت بە مەرگی ..

لە ساتی خۆشەویستیدا شتێک تیاماندا دەکرێتەوە .. جەستە نا ؟؟ بەڵکو زیاتر لەوە .. هەموو دەروازەی واقیع و هەل و مەرج دەکەوێتە سەرپشت .. جا حەقیقەت و واتا جوانەکان و ئەو هەستانەی دوو خۆشەویستەکە لە خۆیانی دەگرن، بەریەک دەکەون ..

وە لەم بەریەککەوتنی بیر و واتا و هەستە ناسکانەوە گونجان ڕوودەدات .. لە ساتێکدا ئەو دووانە وا خەیاڵ دەکەن یەکن و .. کۆتا ماسک لە ماسکەکانی واقیع دەکەوێت و ئەو خۆشەویستییەی لە یەکیان جیا دەکاتەوە دەتوێتەوە و .. دەبن بە یەک بەرژەوەندی و یەک بیرۆکە ..

بەڵام ئەمە ساتێکی خێرایە و دەڕوات چونکە دووبارە واقیعی نەگریس دەکەوێتەوە نێوان دوو خۆشەویستەکە و دووبارە خەم لە یەکیان دوور دەخاتەوە .. خەمی ئەو کات و کاتژمێرەی کە نەما و ئەو ژوانەی کە کۆتایی پێهات و ئەو کاتەی کە دەبێ هەریەک بگەڕێنەوە سەر کاری خۆیان .. وە خەمی ئەو جێگایەی کە هەریەکەیان لە وڵاتێکدا لەیەک جیا دەکاتەوە .. خەمی ئەو جەستەیەی هەریەکەیان لە قەوارەیەکی سەربەخۆی گۆشت و خوێندا لە خۆ دەگرێت .. خەمی ئەو کۆمەڵگایەی هەردوکیان لە خۆ دەگرێت و داوای ئەرک و پابەندییان لێ دەکات .. وە خەمی ئەو ڕابردووەی هەموو ساتێک وەکو هاوبەشێکی ڕەزا گران دێتە ناوەوە ..

ئێمە بەتەنها نازین .. بەڵکو ئەوانی دیکەش هەن .. شەڕ بە ئازادی و پاروو و ژیانمان دەفرۆشن ..

لەم قەرەباڵغییەدا ون دەبین و واقیع خەونەکانمان دەشارێتەوە و لەگەڵ خۆیدا دەمانکاتە بەردەوامییەکی بێ ماناوە لە خواردن و خواردنەوە و نوستن ..

هەڵناسین بۆ ئەوە نەبێت دووبارە تێیدا ون ببین و ژیانمان لە ڕۆتینێکی بێزارکەردا بەسەر دەبەین و هەرگیز ناگەین بە خۆمان .. وە تامی خۆشەویستی ناکەین و نایزانین ..

وە ڕەنگە هاوسەرگیری بکەین و ژیانێکی شێواو و بێدەنگ و ئارام بژین .. تیایدا بە هاوسەرەکانمان دەگەین هەروەک

تێنووسـی ئامادەبوونـی دیـوان[1] .. هەمـوو شـەوێک واژووی دەکەیـن تـا ئامادەبوونمـان لـە ژوانەکـەدا بسـەلمێنین .. وە ژیانـی سێکسـیمان بەبـێ ویـژدان دەژیـن و .. هاوسـەرەکەمان لـە چاومانـدا تەنهـا مـێ یـەک دەبێـت بـۆ دابینکردنـی پێداویسـتی .. کـە دەکرێـت خزمەتکارێـک یاخـود هـەر ئافرەتێکـی تـر جێگـەی بگرێتـەوە بـە بـێ ئـەوەی هەسـت بکەیـن شـتێک کەمـە یاخـود شـتێک ون بـووە ..

❊❊❊

ئارەزوو شتێکی دیکەیە و جیایە لە خۆشەویستی ..

زۆر لـە خۆشەویسـتی کەمتـرە .. چونکـە ئـارەزوو جـۆرە نـەک تـاک ..

پەیوەنـدی نێـوان دوو سروشـتە نـەک دوو کـەس .. پەیوەندییەکـە لـە نێـوان نێـر و مـێ ..

تـاک تیایـدا خـۆی نادۆزێتـەوە بەڵکـو جـۆر و نێرییەتییەکـەی .. وە خۆشەویسـتی ئـارەزوو لـە خـۆ دەگرێـت بـەڵام ئـارەزوو ئـەو لـە خـۆ ناگرێـت ..

بـە خۆشەویسـتی تەنهـا بـۆت دەرناکەوێـت کـە نێریـت .. بەڵکـو بەهەمـان شـێوە بـۆت دەردەکەوێـت کـە فڵانیـت و بـە دیاریکـراوی فڵانـت هەڵبـژاردووە و ناتوانیـت بـە کەسـی دی بیگۆڕیتـەوە ..

---

[1] مەبەسـت ئـەو تێنووسـەیە کـە فەرمانبـەر لـە شـوێنی دەوامەکـەی واژووی تیـادەکات بـۆ سـەلماندنی ئامادەبوونـی

وشـەی ( خۆشـمدەوێیت ) قوڵترین و جوانترین وشـەیە لـە ژیانـی پیاودا، چونکە ئـەوە تەنها وشـەیەک نییـە بەڵکو تەنها دەلاقەیەکـە سـەیری حەقیقـەت و ڕازەکـەی لێوە دەکات ..

وە ژیانـی خاڵـی لـە خۆشەویستی ژیانێکـی سـارد و کێـوی و خاڵـی لـە پەرۆشـی و تـام و چێـژ و خۆشـییە کـە ئـارەزووەکان تیایدا بـە تەنگـی و مردوویـی و بێـزاری و وەڕس بـوون و بۆشـاییدا ورووژم دەکـەن ..

ژیان بە بێ خۆشەویستی .. نامۆ بوونە ..

ئـارەزوو یاریدەمـان نـاکات و، تونییەتیمـان ناکوژێنێتـەوە و جێگـەی خۆشەویسـتیمان بـۆ ناگرێتەوە ..

تەنهـا ڕێگایەکـە بـۆ هەڵهاتـن و چالاکیمانـی پـێ دەپژێنیـن و لـە کۆڵـی خۆمانـی دەکەینـەوە ..

هاوشـێوەی مـەی و قومـار و مـاددە هۆشـبەرەکانە ڕێگایەکـە بـۆ بێهـۆش بـوون و ماندووبـوون و ئایەخـی ..

***

تاکـە شـت کـە ئەتوانێـت جێگای خۆشەویسـتی بگرێتـەوە هونـەرە .. چونکـە هاوشـێوەی ئـەو دەچێتـە دڵـەوە .. وەکـو ئـەو خـودی قوڵمـان بـۆ دەردەخـات و .. دەمانگەیەنێتـە سـاتە هەتـا هەتاییـە پـڕەکان .. وە گەنجینـەو ڕازەکانمـان پیشـان دەدات ..

وە ئـەو هونـەرە نەمرانـەی مـرۆڤ دایـان دەهێنێـت ئامـاژەن بـۆ ئـەوەی کـە تـۆوی نەمـری لـە ناخیدایـە ..

وە ئـەو سـاتە هەتـا هەتاییانـەی ئەزمونیـان دەکات ئامـاژەن بـۆ ئـەوەی کـە لـە دڵیـدا «هەتـا هەتایـی» لـە خـۆ گرتـووە ..

****

وە ئـەو خۆشەویسـتییەی لـە هەمـوو خۆشەویسـتییەک قوڵتـرە، جگـە لـە تەسـەوف و هەسـتی ئاییـنداری هیـچ شـتێکی دی لـە کانیـاوی دڵـدا نایتەقێنێـت .. چونکـە ئـەوە ئایینە مـرۆڤ دەگێڕێتەوە بـۆ ئـەو سـەرچاوەی کانییـەی لێـوەی هاتـووە و مرۆڤـی کەوتـووە نـاو شـوێن و کات دەگرێـت و بـەرزی دەکاتـەوە بـۆ ئاسـمانەکانی ئەبەدییـەت .. وە هیـچ شـتێک بـەرزی ناکاتـەوە بۆ ئـەم ئاسـمانانە جگـە لـە خۆشەویسـتی .. لوتکـەی ئـەو خۆشەویسـتییەی بـە هۆیـەوە بەنـدە لـە تامەزرۆیـی دروسـتکارەکەیدا دەسـتبەرداری خـۆی و دونیـا دەبێـت ..

وە خۆشەویسـتی مـرۆڤ بـۆ ئافـرەت و .. خۆشەویسـتی مـرۆڤ بـۆ هونـەر و .. خۆشەویسـتی مـرۆڤ بـۆ جوانـی .. هیـچ نیـن جگـە لـە هەنگاوەکانـی ئـەو ڕێبـەرە شـاراوەیەی بـەرەو خودامـان دەبـات .. بـەرەو تاکـە خۆشەویسـت کـە شـایەنی خۆشەویسـتییە .. ئەمانـەی دیکـە تەنهـا وێسـتگەی گەشـتنن بـە وێسـتگەی کۆتایـی .. وێسـتگەی گەشـتنەجێ ..

جار لەدوای جار مرۆڤ بۆی دەردەکەوێت کە بابەتی خۆشەویستییەکانی بوونێکی ڕاستەقینەیان نییە .. گوڵ دەوەرێت و خۆر ئاوا دەبێت و ئافرەت پیر دەبێت و شتە نوێکانی هونەریش کۆن دەبن ..

وە ئەو شتانەی لە ئافرەتدا بە جوانی بینیبوون، موڵکی خۆی نییە و پیری لەناویان دەبات .. جوانییەکە هی ئەو نەبوو .. سپاردەیەک بوو بەو سپێردرابوو و دواتر خاوەنەکەی لێی وەرگرتەوە .. ئارەزووەکان دادەمرکێنەوە و ..

هەست و سۆز سارد دەبێتەوە و ..

پیاو بە خۆشەویستییەکەی بەرەو ئافرەتێکی تر هەنگاو دەنێت تا سەرلەنوێ هیوا بڕاوی و بێزاری و وەڕس بوون دووبارە بکاتەوە ..

نا .. خۆشەویستییەکەی لەوە گەورەترە دوو باسک لەخۆی بگرێت ..

بە خۆشەویستییەکەی گوزارشت لە ئامانجە سنووردارەکانی دەکات و پاشان تێیان دەپەڕێنێت بۆ بەهاکانی هونەر و جوانی و چاکە و دادپەروەری و حەقیقەت ..

وە لەسەر لێواری ئەم داماڵراوانە بۆی دەردەکەوێت کە ئەو بەهەموو خۆشەویستییەکەیەوە خودای دەوێت .. چونکە ئەو تاکەیە کە هەموو ئەم بەها بێ کۆتاییانەی تێدا بەرجەستە دەبێت ..

ئەو لە بەرامبەر سنورداردا، بێ سنووورە ..

ئـەوە ئیـدی لـە کۆتاییـدا وەڵامـی ئـەو مەتەڵـەی دەسـتدەکەوێت کـە چەنێکـە سـەری لـێ شـێواندووە .. بۆچـی دروسـت کـراوم .. بۆچـی لـەم دونیایـەدا هـەم ..

ئێستا ئەو دەزانێت بۆچی دروست کراوە ..

تـا بـگات بـە حەقیقەتـی خـۆی و .. درک بـە خوداوەنـدی بـکات .. ئـەو توانـا شـاراوانە کۆرپەلـەی گەنمییـان لـە تـۆی گەنمـدا لەخۆگرتـووە ..

ئـەرزی واقیعیـش تەنهـا ئـەو کێڵگەیەیـە کـە تواناکانـی تـێ فـڕێ دەدات تـا گـەڵا بـکات و بەرهـەم بـدات و بچەسـپێت .. ئـەو توانـا ناوەکییانـە ..

خـۆی وەکـو بەڕێوەبەرایەتییەکـی گـەورە دەبینێـت کـە لـە پانتۆڵێکـی تەسـکی گۆشـت و خوێنـدا تێکـەڵ و پێکـەڵ دەبێـت و تەهـا ڕێگـەی پێـدەدات بـە ڕۆشـتنێکی هێـواش و هەنـگاو هەنگاو و ژیانـی بـە قیسـت و سـات سـات ..

لـە هەمـوو هەنگاوێـک لـە هەنگاوەکانـی و هەمـوو سـاتێک لـە ساتەکانی بـە کارەکانـی شـوێنەوارێک جـێ دەهێڵێـت کـە ئامـاژەی پـێ دەدەن ..

وە هەمـوو ڕۆژێـک کاغـەزی تاقیکردنەوەکـە پـڕ دەکاتـەوە و وەڵامـی پرسـیارە ئەزەلییـەکان دەداتەوە ..

تۆ کێیت ؟ ..

دەتەوێت بڵێیت چی ؟ ..

دەتەوێت چی بکەیت ؟ ..

چی لە دڵتدا دەشاریتەوە ؟ ..

تا ناواخنی خۆی بۆ دەربکەوێت و خۆی بسەلمێنێت ..

خۆشەویستییەکەی بۆ خۆی و بۆ ئافرەت و بۆ پلە و پایە و بۆ دەسەڵات دەبیات بەرەو بێ هیوایی لەدوای بێ هیوایی و بێزاری لەدوای بێزاری و تێکشکان لەدوای تێکشکان، تاکو ئەو ساتەی خۆشەویستی ( حەق ) لە دڵیدا هەڵدێت و ڕێگەکەی نیشان دەدات .. بەرەو ئەو تاکە یەکەی هەموو کەماڵی تێدا کۆدەبێتەوە ..

وە خۆشەویستییەکەی قوڵ دەبێتەوە تا ببێتە پەرستش و نوێژ و .. بە ڕێگەی گەڕانەوە بە سەرچاوەی ڕووناکییەکاندا سەردەکەوێت ..

وە ئێستا ئەو هەست دەکات کە بەڕاستی خۆی دۆزییەوە و خوداکەی ناسی و ئامانج و ڕێگاکەی خۆی زانی ..

وە درک دەکات کە هەموو ئەو ئەشکەنجە و ئازار و تێکشکان و بێ هیوا بوونەی چەشتی بە خۆڕایی نەچوو .. چونکە هەموو ئەو ئازارانە بوون ئەو ئاماژانەی ڕێگاکەیان بۆ دۆزییەوە و

حەقیقەتەکەیـان نیشـاندا .. قیبلەنمـا و ڕێنیشـاندەری بـوون لـە دەریـای تاریکیـدا ..

وە لەبەر ئەمە خودا ژیانی دروست کردووە ..

مرۆڤ موعجیزەی دژ یەکەکانە

خۆی لەناوچووە و نەمری لەخۆ گرتووە ..

دەمرێت و زیندووش دەگرێتەوە ..

کۆیلەیـە و دڵێکـی ئـازادی لـە بـاوەش گرتـووە و کاتییـە و هەتـا هەتایـی لـە خـۆ دەگرێـت ..

وە خۆشەویسـتی و هونەر و بیرکردنەوە و تەندروسـتی و نەخۆشـی و جەسـتە و توێکارییەکـەی هەمـوو ئامـاژە بـەم پێکهاتنـە دژ یەکـە دەدەن ..

هەمـوو دونیـا کـۆت و بەنـدی دەکەن و جەستەشـی وەکـو چاکەتێک لـە گـەچ کـۆت و بەنـدی دەکات .. لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەم کـۆت و کەلەپچانـە ڕێگـری ناکـەن لـەوەی شـتێک لـە خۆیـدا بشـارێتەوە و .. ئـەو شـتە بەسـەر بارودۆخەکەیدا فـەرز بـکات ..

ئەوەتـا ئـەو ئاسـن دەتوێنێتـەوە و شـاخەکان یەکسـانی زەوی دەکات و تونێلـەکان شـەق دەکات و موشـەکی چەندین تەنـی بـەرەو مانـگ بـەڕێ دەخـات .. هەمـوو ئەمانـە .. لەکاتێکـدا جەسـتەیەکی جەلاتینـی بچووکـە لـە گۆشـت و خوێـن ..

کاتێــک نەخۆشــێکی ئیفلیجــی کەوتــوە لــە زەویــدا و لەگــەڵ هاوســەرەکەی کۆدەبێتــەوە، منداڵێــک دەخاتــەوە لــە تەندروســتی و ســەلامەتیدا ســەما دەکات .. ئــەم تەندروســتییە شــاراوەیە لــە نەخۆشــیدا لەکــوێ بــوو ..

کاتێـک لاواز و بـێ دەسـەڵاتە و .. گوللەیەکی ملیمـی دەیکوژێـت .. هـەروەک ئـەو گوللەیـەی سـەگێک دەکوژێـت .. بـەڵام دەتوانێـت پێش ئـەوەی بمرێـت هاوارێـک بـکات کـە سیستەمێکی تـەواو بڕوخێنێت ..

لـە کـوێ وە دەنگـی دەردەچێـت و .. بیرکردنەوەکانـی خـوڕ دەکـەن و .. هەســتەکانی دادەمەزرێــن و .. هێــزە بــێ ســنوورەکەی ورووژم دەکات ..

لـە توێکاریـدا ئەندامەکانـی وا دەردەکـەون لـە ماددەیـەک بـن قابیلی کێشــانە و پێوانــە بــن و ملکەچــی کات بــن .. بــەڵام هەســتەکانی ماددەیەکــی دی دەردەخــەن و کاتێکــی دیکــەی جیــاواز لــە کاتــی کاتژمێـر و خولەکـەکان .. کاتێکـی ئـازاد کـە بەویسـتی ئـەو کـورت و درێــژ دەبێتــەوە ..

وە قوڵبوونــەوەی ئــەم هەســتە لــە ســاتەکانی خۆشەویســتی و ئیلهــام و تەســەوفدا .. ڕاســتییەکی ســەیرتر دەردەخــەن ..

ئاسۆی سێیەم لە ناخیدا هەیە ..

ئاســۆیەکی ناکاتــی .. ســاتەکانی پــڕ و هەتــا هەتاییــن .. وەکــو ســاتەکانی دیکــە تێناپــەڕن بەڵکــو بــە ئەبلەقــی لــە هەســتەکاندا دەمێننــەوە و ویــژدان پــڕ دەکــەن ..

دەبێت ئەو ساتانە چیبن ..

بڵێیت ئەو کونانە بن کە لێوەیان تەماشای ڕازەکەی دەکات ..

وە دەبێت ڕازە شاراوەکەی ژێری چی بێت ..

ئایا ڕووحە ؟؟

ئەدی ڕووح چییە ؟؟

ئازادییە ..

ئازادی کرۆک و ڕوحی مرۆڤە .. وە لە هەوڵدانیدا بۆ تێگەیشتن لە ئازادی، لە تێگەیشتن لە ڕوحیش نزیک دەبێتەوە ..

٦





# دەزوو

تــەوژم دەزوو و پوشــی نــاو دەریــا دەجولێنێــت و (بــا) ش لقــی درەختــەکان ..

مرۆڤیش بەتەنها .. تاکە کەسە ویستی دەیجولێنێت ..

جوانتریــن شــتی دونیــا ئەوەیــە ڕوونــە .. خــۆر پــڕی کــردووە .. هەمــوو شــتەکانی نــاوی دەتوانیــت ببینیــت و بیکێشــیت ببیســتیت و بپێویــت و تامــی بکەیــت و شــی بکەیتــەوە و بــۆت دەربکــەون ..

هەرچــی تێــدا ڕوودەدات هــۆکاری هەیــە .. گــەر هۆکارەکەیــت زانــی تــۆش دەتوانیــت ئــەو ڕووداوە دروســت بکەیــت .. هەمــوو شــتێک بــە سیســتمێکی تۆکمــە لــە هــۆکار و دەرئەنجــام ڕوودەدات .. وە ئەگــەر کاغــەز و پێنوســێکت پــێ بێــت ئــەوا دەتوانیــت ڕێــک بــە دیاریکــراوی بزانیــت کــەی خــۆر هەڵدێــت و کــەی ئــاوا دەبێــت .. چونکــە بــە یاســا دەجولێتــەوە ..

وە هەموو شتێکی دونیا بە یاسا دەجوڵێتەوە ..

تەنها مرۆڤ نەبێت .. ئەو هەست دەکات بە ئارەزووی خۆی رێ دەکات ..

تەنها مرۆڤ ئەو ئازادە یاخییەیە لە سروشت و بارودۆخی خۆی , بۆیە دەکێشێت بە جیهاندا و زۆرانبازی لەگەڵدا دەکات .. وە ئەستەمە لەهیچ ساتێکیدا پێشبینی سەرەنجامی بکات ..

ئەوانەی لەناخ و دڵی مرۆڤدا ڕوودەدەن ملکەچی یاسا نین .. لە ناخی ئێمەدا ئەو ئەڵقە پەیوەستانە لە هۆکار و دەرەنجام بوونیان نییە .. ئارەزوو دەکەین .. پەرۆش دەبین و .. کاردەکەین بەڵام ئەم زنجیرەیە لە ئارەزوو و پەرۆشی و کارکردن حەتمەن شوێن ئەوی دی ناکەون .. بەڵکو مرۆڤ لە هەرساتێکدا توانای لادانی دەمێنێت .. جا ئەگەر وا دەربکەوێت کە دەبێت چاوپۆشی بکات،

ئەوا ئارەزووی دەمرێت و پەرۆشییەکەی سارد دەبێتەوە و هەنگاو نانێت بەرەو مەبەستەکەی ..

هۆکار چییە ؟

هۆکاری نییە ..

چیدی نایەوێت .. چۆن ..

جا بۆچی چیدی نایەوێت ..

هەروا ..

هەروا بە سانایی چیدی ئەو نایەوێت ..

تەنها ویستەکەی هۆکارە .. پێویست بە هۆکاری دی ناکات .. وە پێویستی لە هیچ شوێنێکی ئەم دونیایە بوونی نییە جگە لە مرۆڤ .. ئەو تاکە کەسە خۆی خۆی بنیاتناوە .. وە هەموو رۆژێک لە دایکبوونێکی تازە لەدایک دەبێت .. پێش دەکەوێت و دروست دەبێت .. کەسایەتییەکەی دەگۆڕێت و گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت ..

ویستەکەی دەچێتە هەر ساتێکەوە دەستکاری دەکات و هەر شەرت و مەرجێک هەبێت هەڵی دەوەشێنێتەوە، هەر کاتێک بیەوێت ..

لەبەر ئەوە پێشبینی کردنی ئەستەمە .. چونکە هەر ساتێک نوێیە و هیچ پەیمانێکی لەگەڵ پێش خۆیدا نییە ..

هیچ شتێک نابێتە بەربەستی ئەوەی مرۆڤ شتێک لە ناخیدا بشارێتەوە .. ئەو تاکە بوونەوەرە خاوەنی رووتەختی خەونەکانییەتی ..

❊❊❊

بەڵام ئەوەندە ناخایەنێت ئەم ئازادییە پاکیزە رەهایە دەکێشێت بە جیهاندا کاتێک بۆیەکەم جار لە ساتی ئەنجامداندا بەری دەکەوێت ..

ئارەزووەکانمان ئازادن تا ئەوکاتەی لە ویژدان و نیەتماندان ..

دەتوانین هەر ئارەزوویەک بمانەوێت ئارەزووی بکەین و .. هەر خەونێک بمانەوێت ببینین و .. هەر ئاواتێک بێت هیوا خوازی بین .. بەڵام ناسۆرییەکە لە ساتی جێبەجێ کردندا دەست پێدەکات .. ئەوکاتەی ئارەزووەکانمان هەوڵ دەدەن خۆیان لە واقیعدا بسەلمێنن .. دەکێشن بە کۆت و بەندەکاندا ..

یەکەم کۆت و بەندیش کە پیای دەکێشین جەستەیە .. هەمان ئەو جەستەیەی خۆمان کە وەکو چاکەتێک لە گەچ دەورمان دەدات و .. لە پێداویستییەکاندا قەتیسمان دەکات و داوای خواردن و خواردنەوەمان لێ دەکات تا بژی و بەردەوام بێت .. هیچ ڕێگایەکی هەڵاتن لەم داواکارییانەش نادۆزینەوە .. بۆیە بەدوای پاروودا ڕادەکەین و بەدوای کاردا هەناسە برکێ دەکەین و لە زۆرانبازی بە دەستهێناندا ون دەبین و بەشێک لە ئازادییەکەمان لە دەست دەدەین ..

جگە لەمە هیچ ڕێگایەکی دیکەشمان لەبەردەمدا نییە چونکە ئارەزووەکانمان بە بێ جەستە ناتوانن خۆیان ڕابگەیەنن ..

جەستەمان کەرەستەی ئازادییەکەمانە .. ئەگەرچی لە هەمان کاتدا ئەو ئازادییە بەندیش دەکات .. وە نەک بە تەنها جەستەی خۆمان بەڵکو جەستەی ئەوانی دیش بە هەمان شێوە کەرەستەی ئێمەن .. ئێمە سوودمەند دەبین لەوەی کرێکار دروستی دەکات و باخەوان و داهێنەر دای دەهێنێت و ئەوەشی نووسەر دەینووسێت .. هەموو ئەمانەش بەرهەمی جەستەی ئەوانی دی و ئازادییەکەیانە

کۆمەڵگا کەرەستەیەکی قەبەیە و بە هەموو ئەوەی تێیدایە لە گەیاندن و هۆیەکانی گواستنەوە و ئاو و و پیشەسازی و زانست و زانیاری، خراوەتە خزمەتی ئێمەوە ..

وە کاتێک یەکێک لە ئێمە سواری شەمەندەفەرێک دەبێت ئەوا لەهەمان کاتدا سواری ئازادییەکی ئامادە دەبێت کە بەهەزارەها کرێکار و داهێنەر و ئەندازیار بە درێژایی چەندین ساڵی مێژوویی ئامادەیان کردووە .. ئەویش لە بەرامبەر ئەمەدا باجێک لە ئازادییەکەی خۆی دەدات ..

ئەوە تەنها کۆمەڵگاش نییە باجی لێی دەوێت .. بەڵکو هەموو گەردوون .. هێزی ڕاکێشانی زەوی و .. پەستانی هەوا و .. ئاوی زەریاکان و دارستانەکان بە ئاژەڵ و باڵدار و ئاسمانیش بە هەسارەکانییەوە .. هەموویان قەتیسی دەکەن و ئازادییەکەی قەتیس دەکەن و داوای جۆرێک لە ڕێکەوتنی لێ دەکەن .. هەموو جارێکیش بە ڕێکەوتن ئازادییەکەی وەدەست دەخات ..

ئەو بە ڕێکەوتن لەگەڵ جیهاندا سەری دەکەوێت هەروەک چۆن سواری ئەسپێک دەکەوێت ..

ئەوتا کاتێک ئاگاداری ئاراستەی (با) دەبێتەوە .. بەلەمە چارۆکەدارەکەی ڕووبەڕوو دەکاتەوە و سواری (با) یەکە دەبێت دەیخاتە خزمەتی خۆیەوە ..

وە کاتێک دەزانێت تەختە لە ئاو سوکترە و .. بەلەمێکی لێ دروست دەکات .. سواری ئاو دەکەوێت .. بەهەمان شێوەش

کاتێک سەرنجی سوود و قازانجی خەڵکی دەدات و بە ئاڕاستەیان دەڕوات .. خەڵک بەدەست دەهێنێت و هاریکاریان بە دەست دەهێنێت ..

کۆمەڵگا فشار دەخاتە سەر تاک و ئازادییەکەی .. بەڵام هەمیشە ئاوەز دەتوانێت ئەم فشارە هەڵاو گێر بکاتەوە بۆ قازانج و بەرژەوەندی و ئازادی .. دەتوانێت بە بینابیەکەی ئەو یاسایانە بدۆزێتەوە کە شتەکان پێکەوە گرێ دەدات ..

***

مرۆڤ بە شڵەژاوی لە نێوان دوو جیهاندا دەژی .. جیهانی هەوەس و ئارەزووەکانی کە هەموویان ئازاد و سەرشێت و بێ سنوورن .. وە جیهانی ماددەی دەوروبەری کە جیهانێکی بێگیان و سنووردار و قوفڵ کراوی ناو یاساکانە .. تاکە ڕێگاش ناسین و زانینی ئەو یاسایانەیە ..

بە بێ زانست و ئازادییەکەی ناتوانێت ڕێگاکەی تەی بکات .. بە بێ زانست .. دەبێتە تەنها ئارەزوویەکی شێتانەی ناو ناخی .. تەنها نیەتێک .. تەنها خەون و هیوایەکی زیندانیکراو ..

تەنها ئازادییەکی بوونییە دەشێت بکرێتە ماددەی چیرۆکێک یا هۆنراوەیەک یا گۆرانییەک .. پەیکەرێک .. سەر کەشتییەک .. تاوانێکی کوشتن .. بەڵام بۆ دەستکەوتی ڕاستەقینە و واقیعی دەست نادات ..

جیاوازی نێوان کۆیلایەتی و ئازادی هێڵێکی باریکە .. هێڵێکی باریکە مرۆڤ سەمای لەسەر دەکات و .. جۆلانی دەکات ..

گەر کەوتە ناو ناخی خۆیەوە ئەوا ون دەبێت لە خەونەکانی ئاگایی و تێڕوانین و ئاواتەکاندا ..

وە گەر کەوتە ناو جیهانەوە ئەوا لە گێژەڵووکەی کاتی ئۆتۆماتیکیدا ون دەبێت .. ڕۆتین و داب و نەریتەکان دەیبەن و .. کۆمەڵگا قولتی دەداتە ناو ناخی خۆیەوە ..

کاتێک چاوەکانی دەکاتەوە و تەماشای جیهانی چواردەوری دەکات دەتوانێت بە ئازادییەکەی ڕزگاری بێت و بەسەر پەتەکەدا چەند هەنگاوێکی فراوان بۆ پێشەوە بنێت ..

ڕێگای تەسکە و پڕ مەترسییە .. مەرگیش لە هەموو لایەکەوە نیشانەی لێ دەگرێتەوە ..

لە سەرییەتی خوێندنەوە بۆ هەل و مەرجی دەوروبەری بکات بە هەموو بەرزی و نزمی و بەربەستەکانییەوە .. هێزەکانی ناوی ئاشکرا بکات و .. ڕێگاکە شارەزا ببێت بۆ لێخوڕین و سوود لێ وەرگرتن ..

ئەو هێڵەی بەسەریدا دەڕوات هێڵێکی تەسکی واقیعە .. لە لایەکەوە جیهان دەپێچێتەوە و .. لە لایەکی دیکەوە ئارەزووە سەر شێتەکانی .. وە ئەگەر چووە ناخی خۆیەوە و نەچووە پەناگەی ئارەزوو و خەونەکانی و خۆی بەسەر خودی خۆیدا داخست .. دەمرێت هەروەکو چۆن ئەو گوڵەی لە دارەکە جیا

دەبێتــەوە دەمرێــت .. ئارەزووەکــەی دەیکاتــە کۆیلــە و حەزەکانــی زیندانــی دەکــەن ..

ئەگەریــش لــە کۆمەڵــگادا توایــەوە و هاوشــێوەی مــەڕ ملکەچــی خەڵــک بــوو .. دەمرێــت و کەســایەتییەکەی لەدەســت دەدات ..

پەتــی ڕزگاربوونیــش ئــە هێڵــە باریکەیــە .. ئــەو هێڵــەی تیایــدا پێکــدادان لــە نێــوان ناخــی و جیهانــدا ڕوودەدات ..

لـە نێـوان نـاوەوە و دەرەوەیـدا .. ئـەو هێڵـەی تیایـدا ئارەزووەکانی ڕۆژی سـەد جـار بـە دونیـاوە دەلکێـن ..

پەتــی ڕزگاربــوون ئەوەیــە لەیــەک کاتــدا خــودی و بابەتیــش بێــت .. چـاوی بەسـەر ناخیـدا کـراوە بێـت و ..ئـاگاداری ئەوانـەش بێـت کــە لەچــواردەوری دەگوزەرێــن .. وە بــەردەوام لــەم پاترییــە دوو جەمســەرەوە چالاکییەکــەی ورۆژم بــکات ..

تەنهـا بەمـە خـۆی دەباتـەوە و ((جیهانیـش دەباتـەوە)) و دەبێتـە مرۆڤێکـی ئـازاد ..

***

بـەڵام ئایـا دەتوانێـت ئازادییەکـەی بباتـەوە بـە بـێ سـنوور .. هیـچ دەسـەڵاتێک لەسـەر بارودۆخـی نەبێـت ..

ئایــا دەتوانێــت بڵێــت مــن سەرپشــکم و هیــچ هێزێــک لەســەروو ئــەوەوە نییــە ســەرەنجام و قــەدەری بــۆ بکێشــێت ..

یاخــود ئازادییەکــەی مەبەســت لێــی ئازادییەکــی مرۆڤانــەی سنووورداری ڕێژەییــە .. وە ئایـا شـوێنی ئێمـە لە کێشـە ئەزەلییەکەدا لــە کــوێ دایــە .. لــە نێــوان سەرپشــکی .. و زۆر لێکراویــدا ..





## سەرپشک یاخود ناچار

مرۆڤ سەرپشکە لەوەدا کە دەیزانێت ..

وە ناچارە لەوەدا کە نایزانێت ..

پرسیارێکی سەرلێشێوێنەرە ..

ئایا من سەرپشکم یاخود ناچار ؟ ..

لە هەموو ساتێکدا هەستم دەڵێت کە من ئازادم ..

وە واقیعیشم لە هەموو ساتێکدا هەزار و یەک جۆر زۆر و زۆرداریم بۆ دەردەخات ..

من لە کوێی ئەم کێشەیەدام ؟ ..

ئایا ئەوە منم ژیانی خۆم هەڵدەبژێرم ؟ ..

یاخود ئەوە ژیانمنە بۆم هەڵدەبژێرێت ؟ ..

وا ڕاهاتبــووم هــەر جارێـک لــە نوسـراوێکدا ئــەم بابەتـە تاوتــوێ بکـەم، لایەنـی ئـازادی هەڵبژێـرم .. وە هەمـوو جارێکیـش بـە لێشـاو وتــاری نارەزایـی خوێنەرەکانـم پێدەگەشـتەوە ..

بۆیــە بیــرم کــردەوە ئــەم جــارە بــە ڕێـگای گفتوگـۆ بچمــە نــاو باسـەکەوە .. وە بیخەمـە سـەر شـێوەی گفتوگۆیەکـی سـوقراتی بـە جۆرێـک لـەو کێشـەیەوە دەسـت پێبکـەم کـە خوێنـەرەکان لـە وتـار و پرسـیارەکانیاندا پێیـان وایـە کێشـەیە و، پاشـان لـە پرسـیارەکانی ئەوانــەوە دەروازەیــەک وەربگــرم بـۆ چوونـە نـاو باسـەکەوە .. تاکـو بـەم شـێوەیە نزیکتـر بـم لـە ئـاوەز و وێنـا کردنـی گشـتی خوێنـەرەوە

***

خوێنــەر ( احمــد ناجــی شــرف الدیــن ) لــە وتارێکــی درێــژدا دەربــارەی نوســراوەکەم دەڵێــت :

... شــەش هــەزار ڕۆژ ژیــاوم و نازانــم بۆچــی دەژیــم .. وە بــۆ کــوێ مــل دەنێــم .. بیسـت و سـێ سـاڵ ژیـاوم و نازانـم ڕۆڵــی ڕۆمانێکـی هەتـا هەتایـی دەگێـڕم .. لـە خـەو هەسـتان .. خەوتـن .. خواردنـەوە .. خـۆراک .. بێدەنگـی .. قسـە کـردن .. خۆشەویسـتی و دوژمنایەتـی .. ڕۆژەکان دێنـەوە و .. سـاڵەکان دەڕۆن و .. تەمـەن تێدەپەڕێـت بـێ ئـەوەی بزانـم مـن کێـم و .. بـۆ هاتـم و .. بـۆ کـوێ دەڕۆم ..

مـن بـە دوای داهاتـوودا ڕادەکـەم ..لـە داهاتـوودا بـە ئاواتەکانـم دەگـەم .. خـۆم چاک دەکـەم و .. دەگەڕێمـەوە بـۆلای پـەروەردگارم و .. ئـەو واتايانـە دەنووسـم کـە ناخـم پێيانـەوە مانـدوو بـووە .. بـەڵام هەرگيـز داهاتـوو نايـات .. وە کاتێـک دێـت دەبێـت بـە ئێسـتا و منيـش دەسـت دەکـەم بـە گـەڕان بـە دوای داهاتوويەکـی نوێدا ..

کاتێـک لەسـەرەتايی بـووم ئاواتـم دەخواسـت ببمـە خوێنـدکاری ناوەنـدی و پانتۆڵـی درێـژ لـە پـێ بکـەم قـژم دابهێنـم و پارچـە تەباشـير لای خـۆم بهێڵمـەوە تـا دواتـر بيگرمـە منداڵانـی قوتابخانـە و باخچەکـەی دراوسـێی قوتابخانەکەمـان، هـەروەک چـۆن خوێندکارانـی قوتابخانـە ناوەندييەکـەی پاڵمـان وايـان لـێ دەکـردم .. وە ئـەو ڕۆژەی گەشـتم بـەم ئاواتـە بەلامـەوە بـێ نـرخ بـوو و نرخەکـەی ڕۆشـت و ناوازەييەکـەی کوژايـەوە و .. دەسـتم کـرد بـە تەماشـا کردنـی داهاتوويەکـی ديکـە و ئيـدی ئاواتەخـواز بـووم ببـم بـە فەرمانبەرێکـی حکومـەت وەکـو بەڕێـز ئەفەنـدی کـە نيشـتەجێی لای خاڵـم بـوو وە ڕۆژنامەکانـی ڕۆژانـە بـە دەسـتەوە بگـرم و گفتوگـۆی سياسـەتی نێودەوڵەتـی بکـەم و قـاچ بخەمـە سـەر قـاچ و يـاری تاوڵـە بکـەم .. هـەرواش دەرچـوو .. چـوار سـاڵی نەبـرد بوومـە فەرمانبـەری حکومـەت و .. ئـەو تاڵييـەم چەشـت کـە فەرمانبـەر هەسـتی پێدەکات و بەڕێـز ئەفەنـدی لـە ژێـر چاکـەت و زەردەخەنـە هەڵبەسـتراوەکەيەوە دەيشـاردەوە ..

دووبـارە ئەمەشـم لا بـێ بايـەخ بـوو و نرخەکـەی نەمـا و حاڵـم گـۆڕا لـە جيهانـە ساويلکەکەمەوە بـۆ دونيـای کار و فەرمانبـەری و هەمـوو ئـەوەی تيايەتـی لـە مەرايـی و دووڕوويـی و درۆ ..

وە یەکـەم مانـگ هـات تـا یەکـەم موچـە وەربگـرم .. حـەوت جونەیـھ .. لەوکاتـەدا لـە ( اسـیوط )[1] بـووم لـە دووری چەنـد میلێکـەوە لـە ناوچەکـەم .. ئینجـا هەسـتم بـە تەنگـی ژیـان کـرد و .. ئاواتەکانـم ورد و خـاش بـوون ..

نـەم دەتوانـی بـە قاوەخانەیـەک ڕابگـەم و .. کاتێـک بـۆ کۆشـش تەرخـان بکـەم و .. دەسـت پێکردنـی زانکۆشـم چیـدی مەحـاڵ بـوو

ئازادییەکانـم تەسـک بوونـەوە و هیچـی نەمایـەوە جگـە لـە ئـازادی دەسـت کەوتنـی نانـی ڕۆژەکـە و پێـی ڕازی بـم تـا ڕۆژێکـی دیکـەش بژیـم ..

کوانــێ ئــەو ئازادییــەی دەشــیرێنیت و باســی دەکەیــت و نوســراوەکانتی پــێ پــڕ دەکەیتــەوە ..

ئایـا مـن ئـازادم .. وە چـۆن .. لـە کاتێکـدا مـن خەریکـە هـەر ئەوەنـدەم هەبێـت کـە بەسـمە و تەنهـا لـە ماڵـەوە بـۆ دیـوان و لـە دیوانـەوە بـۆ ماڵـەوە، تاکـە ڕێگایـە کـە بـۆ مـن دەشـێت ..

چـۆن هاوسـەرگیری بکـەم و چـۆن بژیـم و چـۆن بـەردەوام بـم لـە خوێنـدن و چـۆن تەندروسـتیم بپارێـزم .. وە چـۆن کاتێـک توانـام نییـە ئـەم هەمـوو ئازادییـە دەستەبەر بکـەم ..

مـن هیـچ ئازادییەکـم نییـە جگـە لەیـەک ئـازادی ئەویـش ئەوەیـە خـۆم بکـوژم ئەگـەر تـۆ پێـت وابێـت ئەمـە ئازادییـە ..

١)) اسیوط : شارێکە لە میسر .

( سمير زكي سوريال ) یش لە ( حقوق القاهره ) دا دەنووسێت و دەڵێت :

ئەگەر ئێمە ئازاد بین ئیدی یاسا و ڕەوشتەکان و ئایینەکان و مەدەنییەت چ واتایەکیان هەیە ..

هەموو ئەم شتانە کۆت و بەندن بۆ ئازادییەکەمان .. یاسا هەندێک شتم لێ قەدەغە دەکات ..

ڕەوشت هەندێک شتم لێ حەرام دەکات ..

ئایینەکانیش دەمترسێنن لە هەندێکی دی و دەمبەستنەوە بە ڕێکار و فەرمان و ڕێگە پێنەدراوەکانەوە ..مەدەنییەت پەیوەستم دەکات بە چەرخی خێزان و ماڵ و کارگە و بزوێنەرەوە وە وەکو کاتژمێر لەسەر چەند وادەیەکی خەوتن و هەستان ڕێکم دەخات

ژیانی دەورووبەرمان سەرلەبەری کۆت و بەندە ..

کوانێ ئەو ئازادییەی تۆ باسی لێوە دەکەیت ..

*** 

موحەممەدیش ئاڵنگاریم دەکات و دەڵێت :

کوانێ ئازادییەکەت ..

تۆ لەدایک بوونی خۆت هەڵبژارد ؟

خۆت باوک و دایک و نیشتمانەکەت هەڵبژارد ؟

ئایا خۆت شێوە و درێژی و پانیت هەڵبژارد ؟

خۆت ئەو سیستەمە ئابورییەت هەڵبژارد کە تیایدا دەژیت ؟

※※※

هەروەها ( عبدالرؤوف ) .. بەکالۆریۆس لە فەلسەفە .. لە توێژینەوەیەکیدا دەنوسێت و دەڵێت :

من کاتێک ئازاد دەبم کە منبم خودا .. یاخود من جیهان بم .. بە جۆرێک جگە لەخۆم ملکەچی هیچ شتێک نەبم و پابەندی هیچ شتێک نەبم ..

ئازادی تەواو، دەخوازێت جگە لە من هیچ شتێکی تر بوونی نەبێت .. چونکە هەموو شتێک سنووردارم دەکات .. خەڵکی .. سروشت و بارودۆخەکان .. هەموویان سنوورن .. وە هاوشێوەی ئەم ئازادییە ئەستەمە ..

کەواتە من ئازاد نیم بە ئەندازەی ئەو کەرەستانەی هەمن بۆ بەدیهێنانی ئەم ئازادییە ..

ئازادییەکەم ئیفلیج و شەلە ..

※※※

(عبد الفتاح سليم) یش بەوە کۆتایی دەهێنێت کە ئەو بێ هەڵبژاردە و زۆرلێکراو و ناچارە بە بارودۆخ و کارەکانی، دواتر دەپرسێت چۆن لە کاتێکدا ئەو ئاوا بێ هەڵبژاردە و زۆرلێکراو و ناچارە کەچی خودا لێپرسینەوەی لێ دەکات و سزای دەدات یاخود پاداشتی دەداتەوە .. کوانێ سیمای دادپەروەری خودایی لەم بابەتەدا ..

*** 

وەلێ ( احمد الالفی ) بەوە کۆتایی دەهێنێت کە ئەو ئازادە بەڵام دەپرسێت چۆن کە ئازادە خودا دەستێوەردان دەکات بۆ یارمەتیدانی .. ئایا ئەم دەستێوەردانە شکاندنی ئازادییەکەی نییە ..

چۆن دەکرێت گونجاندن بکەین لە نێوان بیرۆکەی ئازادی و بیرۆکەی سەرپەرشتی و دەستێوەردانی خودایی ..

چۆن ئێمە ئازادین لە کاتێکدا هەموو ئەوەی ئەنجامی دەدەین بە فەرمانی خودایە ..

هەر لە ئەزەلەوە ئەندازەگیری بۆ کردووین .. خۆی دروستی کردوین و کارەکانیشمان هەر ئەو دروستی کردوون .. تەنها ئەوە « ئەنجام دەدات « و ئێمەش هیچ نین جگە لە کەرەستەکانی ویستی ئەو ..

***

بەم وتار و پرسیار کردنانە خوێنەران هەموو لایەنەکانی کێشە ئەزەلییەکە چوار دەور دەگرن .. کێشەی سەرپشک و ناچار ..

هەموویان چەکەکانیان ڕوودەکەنە من و مێشکیان هان دەدەن .. وە بەیەک دەنگ بەڕوومدا هاوار دەکەن ..

ئەمە بۆخۆی یەکەم بەڵگەیە لەسەر ئازادییان چونکە هەریەکێکیان بۆچونێکی سەربەخۆی دروست کردووە و پەیوەست نەبووە بە کتێب و نوسراوەکانی منەوە و ملکەچی تێڕوانینی من نەبووە ..

جا دەچمە سەر ڕەخنەکانیان و دەڵێم کە زۆربەی زۆریان لە دەوری یەک خاڵ دەخولێنەوە .. ئەویش کۆت و بەندە دانراوەکانی چواردەورمانە .. هەندێک لەم کۆت و بەندانە بۆ ماوەییانە پێمان دەگەن وەکو ناو و ڕەگەز و ئایین و نیشتمان، پێیانەوە لە دایک دەبین هەروەک چۆن بە جەستەمانەوە لەدایک دەبین ..

هەندێکی دیکەیان لە ژینگەکەمانەوە پێمان دەگەن .. وەکو ئەو سروشتەی تیایدا دەژین بە سەرما و گەرما و هەورە بروسکە و میکرۆب و نەخۆشی و خەڵکەکانیشەوە ..

وە هەندێکی دیکەشیان دەستکرد و داهێنراوی خۆمانن وەکو یاسا و ڕەوشت و سیستەمە سیاسییەکان .. وە لە کۆتاییدا هەموویان ئێمە کۆت و بەند دەکەن و تۆزێک یاخود کەمتر لەوەشمان بۆ دەمێنێتەوە ..

هەر ئەمەشە وا لە خوێنەر ( عبدالروف ) دەكات بڵێت :

ئازادی مەحاڵە .. وەلێ ئەگەر بێت و ڕێی تێبچێت تەنها یەک ڕێگای هەیە .. ئەویش ئەوەیە هەموو شتەکانی دەوروبەرمان لە ناوبچێت .. وە من ببمە تاک و تەنها یەک وەکو خودا .. بێ هاوبەش و بێ هیچ کەسێک لەگەڵما و بێ هیچ شتێک .. زاتێکی ئازادی داماڵراوی بێ هیچ بەرگرییەک لە هیچ جۆرێک .. خوێنەر لە بیری دەچێتەوە کە هەر لەگەڵ کەوتنی بەرگرییەکانی چواردەوری، ئازادیش واتاکەی لەدەست دەدات ، چونکە نەمانی بەرگرییەکان و دەست خستنی هەموو شتەکان بە یەک جار مانای نەمانی کەموکوڕییەکانی من و کامڵ بوونمە .. واتا خۆم هەموو شتێک بم .. بەم جۆرەش داواکاری و ئارەزووەکانم نامێنێت .. چونکە سەرچاوەکەیان پێداویستییەکانی من بوون ..

وە بەنەمانی ئارەزوو و بەرگر ئازادی لە مانا دەکەوێت چونکە دەبێتە ئامانجدارییەکی بەتاڵ بۆ هیچ و خودی خۆشی دەبێتە هیچ ..

کێشەی ئازادی بەردەوام پەیوەستە بە سینە و ناخ و ئەو بەرگرەی لە ڕوویدا دەوەستێتەوە ..

وە ئازادی دووپات دەبێتەوە بە داڕمانی بەرگرەکە و پاشەکشێ کردنی لە بەرامبەر ویستدا ..

بەم وێنە ئارگیومێنتییە ئازادی ماناکەی لە واقیعدا دەردەکات

بەڵام ئەو مرۆڤە تاقەی بارودۆخ و بەرگرییەکان لە بەرامبەریدا ورد و خاش بوونە و هیچ شتێک لە چواردەوریدا نەماوە و .. خۆی بووەتە هەموو شتێک .. هەموو جیهانی گرتۆتەوە و .. بووە بە خوداوەند .. ئیدی ئەم بوونەوەرە چی دەوێت و چ شتێک دژایەتی داواکارییەکەی دەکات تا ئازادی یاخود ئازاد نەبوونی ببێتە جێگەی پرسیار ..

کوانێ ئەو زۆرانبازییەی مانای ئازادی تیا دەردەکەوێت ..

نموونەی ئەم بوونەوەرە ناجوڵێت و ئارەزووی نییە و ناخوات و ناخواتەوە و گەشە ناکات و گەورە نابێت و نامرێت و لە دایکیش نابێت ..

لە ئارامی و هەتا هەتایی و جیهانێکی بێ کات و بێ جێگە و رێگەدا دەژی .. وە وشەی ئازادی لای ئەو جیاوازە لەوەی ئێمە دەیزانین و باسی لێوە دەکەین .. چی دەوێت لە کاتێکدا ئەو دەستبەردارە و خۆی بە لاوە بەسە ..

ئەو ئازادییەی باسی دەکات وشەیەکی ئادەمیزادی پەتییە .. وشەیەکە هیچ واتایەک نادات بە دەستەوە مەگەر بە بوونی کۆت و بەندەکان .. بە بوونی بەرگرەکان .. بوونی ئەو بارودۆخانەی خوێنەران سکاڵای لێ دەکەن و لێی بێزارن و هاوار هاواریانە لەدەستی ..

ئەوە دانانی حەتمییەتە لە چواردەوریان مانا دەبەخشێت بە ئازادییەکەیان نەک لەناوی ببات وەکو ئەوان پێیان وایە ..

چونکە ئازادی بە بەزاندنی بارودۆخەکان و خشاندنی بەرگرەکان و ڕوخاندنی بەربەستەکان گوزارشت لەخۆی دەکات ..

ئازادی پرۆسەیەکی پەیوەستە بە لێکخشاندنی مرۆڤ لەگەڵ ژینگە و بارودۆخەکانیدا و هەر مرۆڤ ببێتە خودا، ئەویش هەڵدەوەشێتەوە ..

پرسیارە گرنگەکە ئەمەیانە :

ئایا بە تێپەڕبوونی کات بەرگرەکان دەتوێنەوە ..

ئایا کۆسپەکان پاشەکشە دەکەن .. کۆسپێک لە ژێر فشار و ویستی مرۆڤدا یەکێکی دی دروست دەکات .. یاخود هەموو ژیانمان وەکو گەڕەکێکی بەربەستە ..

وەڵامەکەش بریتییە لە بەڵێ .. کۆسپەکان پاشەکشە دەکەن و .. زانست پێش دەکەوێت و کۆنترۆڵی ساردی و گەرمی و ئاو و با دەکات و یاسا و سیستەمەکان بەرەو باش و باشتر پێش دەخات ..

لەمەشدا بەڵگەیەکی واقیعی دڵنیا هەیە لەسەر ئازادی مرۆڤ ..

***

دەست بنێ بە دوگمە کارەباییەکەی ژوورەکەتدا ڕووناکی بڵاو دەبێتەوە و تاریکی دەبەزێت ..

هەست ناکەیت ئەم دەستکەوتە زانستییە سادەیە لە ئازادییەکەی تۆی زیاد کردووە و هەموو ساتێک سوود لە هەزارەها نموونەی تری وەکو ئەم دەستکەوتە دەبینیت .. کاتێک قاچ دەخەیتە شەمەندەفەری شەقامەوە یاخود دەچیت بۆ سینەما یاخود کتێبێک دەخوێنیتەوە یاخود بە تەلەفۆن قسە دەکەیت ..

هەموو شتێک بە گوێتدا هاوار دەکات کە تۆ ئازادیت و مێژووش بە هەناسە برکێوە بەرەو پێشەوە ڕادەکات تا دڵنیات بکاتەوە تۆ ئازادیت ..

مانگە دەستکردەکانیش لە بۆشاییدا هوتاف دەکێشن کە هەرکەسێک هەوڵ بدات دەگات و ڕێگاکە کراوەیە لەبەردەم ویستی ئادەمیزادا ..

قەدەریش تەنها هۆکارێکە ئازادی خۆی پێ دەدۆزێتەوە و بوونی خۆی دووپات دەکاتەوە ..

***

هەروەها خوێنەر هاواردەکات و دەڵێت .. ئایا من ئازادم لە کاتێکدا هەر ئەوەندەم هەیە کە بیخۆم .. بەمەش واتا کۆمەڵایەتییەکەی کەیسی ئازادی دەوروژێنێت .. چۆن کەسێک پارووەکەی نەبێت ئازاد نییە .. وە دابین کردنی پاروو لەهەمان کاتدا دابینکردنی ئازادیش بێت ..

پرسیارەکەش ئەوەیە ئەم پارووە چییە کە داوای دابین کردنی دەکرێت .. ئایا خواردنێکە برنج و گۆشت و نان و میوەی

لەسەرە و بەفرگرێک بۆ هەڵگرتنی ئەم خواردنانە و ئۆتۆمبێلێک تا هەریەکەمان بچێ بەلای کاریدا و ئەم پاروانە دابین بکات ..

ئەگەر ئەمە ئەو پارووە داواکراوە بێت ئەوا ئازادی بەمە دابین نابێت بەڵکو بە فیڕۆ دەدرێت .. واتای ئەوەیە مرۆڤ لە خزمەتی خواردندا بێت نەک خواردن لە خزمەتی مرۆڤ .. واتای بە فیڕۆدانی کات و هەوڵ و بیر لە چەسپاندنی فرەیی ماددی و واتا لە کۆتاییدا مرۆڤ ببێتە بەندەی ئەم فرەییە و ئازادییەکەی لە دەست بدات ..

بەڵام ئەگەر مەبەست لە پاروو ئەوەندە بێت کە بەش بکات ئەوکات بابەتەکە ڕاستە چونکە کاتێک پارچە نانێک نییە ئازادیش نییە .. وەلێ ئەگەر ئەم پارچەیە دابین بوو کە ئەمەش کارێکی ئاسانکراوە ئەوکات گەڕان بەدوای زیاتردا دەستخستنی ئازادی نییە بەڵکو بە فیڕۆدانییەتی .. گاندی ئازادترین کەس بوو و بە پێی پەتی ڕێی دەکرد و هیچی نەبوو جگە لە تەشییەکی خوری دەستی و کیسەیەک چەند بەروبومێکی تیابوو و هەروەها ئاژەڵێک لە شیرەکەی دەخوارد و خورییەکەی دەکرد بە جل و بەرگ ..

موحەممەد و مەسیحیش هەروا بوون .. بەهەمان شێوە هەموو ئەو ئازادیخواز و مەزنانەی ژیانیان بۆ دروست کردین و مێژوویان گۆڕی ..

مەرجی ئازادیش لێرەدا ئەوەیە ئەوەندەت هەبێت کە بیخۆیت و بەشت بکات چونکە زیاتر لەمە ملکەچییە بۆ بەندایەتی کردنی ورگ هەروەک چۆن بەهەدەردانی تەمەن لە ڕاکردن بەدوای

ئافرەتـدا ملکەچییـە بـۆ بەندایەتـی کردنـی ئـارەزوو ..

وە هـەق نییـە خوێنـەر لەبەرئـەوەی تەنها ئەوەنـدەی هەیـە بیخوات هـاوار بـکات و بڵێـت .. کـوا ئازادییەکـەم .. ئازادییەکـەم لەدەسـت دا ..

بەڵکـو تـۆ ئازادییەکـەت دۆزییـەوە مـاددەم ئەوەنـدەت دۆزیوەتـەوە بەشـت بـکات .. چونکـە زیاتـر لەمـە ئـازادی نییـە بەڵکـو کۆیلایەتییە

❊❊❊

هەروەهـا تانـەدان لـە ڕەوشـت و دانانـی بـە کـۆت و بەنـدی ئـازادی .. بەهەمـان شـێوە بـۆ یاسـا و ڕێـکارە ئایینییـەکان، ڕاسـت نییـە .. چونکـە ئـەم ڕێکارانـە وەکـو هێمـا سـور و زەرد و سـەوزەکانی هاتوچـۆن ..

بـە بـێ هێماکانـی هاتوچـۆش ئۆتۆمبێلـەکان بەیەکـدا دەکێشـن و هاتوچـۆ دەوەسـتێت و شـۆفێرەکان ئازادییەکەیـان لەدەسـت دەدەن ..

ئامانجـی ئـەم هێمایانـە ڕەخسـاندنی زۆرتریـن ئازادییـە نـەک بـێ بەشـکردن لـە ئـازادی .. بەڵکـو ئـازادی بـە بێ ئـەم هێمایانـە مەحاڵە چونکـە بـێ ئەمـان کۆمەڵـگا وەکـو دارسـتانی لێدێـت و لەناوخۆیانـدا یەکـدی دەخـۆن .. وە کاتێـک تـۆ ڕێـکار بـۆ ئارەزووەکانـت دادەنێیـت ئازادییەکـەت بەدەسـت دەهێنیـت چونکـە دەبیتـە گـەورەی خـۆت نـەک بەنـدەی ئـەو ئـارەزووەی لـە چەنـد سـاتێکدا ئـاوەزت دەخـات

.. بەهەمان شێوە ئازا لە ترسنۆک و چەوساوە ئازادترە ..

سەخی لە چرووک و گەمژە ئازادترە ..

ئارامگر لە ڕاڕای ترسنۆک ئازادترە ..

بەڵام ئازادی قومار و سەرخۆشی و کێشانی مادده هۆشبەرەکان و خراپ بەکارهێنانی ئارەزووی سێکسی، ئازادی نییە .. ئەمانە چەند پلەیەکن لە خۆکوشتن و بەهەدەردانی ژیان و بەهەدەردانی ئازادی .. وە هەر هەڵبژاردەیەک دژی یاسای ئاسایی، هەڵبژاردە نییە، بەڵکو بەهەدەردانی هەڵبژاردەیە ..

هەمووومان دەزانین گەر بمانەوێت ئازادیمان لەکاتی مەلە کردندا زیاد بکەین ئەوا بە ئاڕاستەی تەوژمی ئاوەکە مەلە دەکەین نەک بە پێچەوانەیەوە ..

وە کاتێک مرۆڤ یەکەم پانکەی بە ئاڕاستەی هەوا دانا، پانکەکە خولایەوە بەمەش توانی ئاشی با دروست بکات و بەهۆیەوە سروشت بخاتە خزمەتی خۆیەوە و لە ئازادییەکەی خۆی زیاد بکات .. ئەو ئێستا تۆربین لە تاڤگە ئاوەکاندا دادەنێت و کارەبای لێ بەرهەم دەهێنێت .. ئازادی بەردەوام دۆزینەوەی یاسای سروشت و کارکردن بە ئاڕاستەی بووە نەک کارکردن لە دژی ..

بەهەمان شێوە بریتییە لە دۆزینەوەی یاساکانی جەستە و نەفس و ڕوح و کارکردن لەگەڵ ئاڕاستەیاندا بە ڕەوشت و ڕێزگرتنی بەرامبەر و ئایینداری و گوێڕایەڵی کردنی یاساکان ..

سەبارەت بەو خوێنەرەش کە ئاڵنگاریم دەکات و دەڵێت :

ئایا خۆت شێوە و درێژی و پانیت هەڵبژاردووە ..

دەڵێم نەخێر من نە شێوەی خۆم هەڵبژاردووە و نە درێژی و نە پانیم .. وە ئەمانەش بە کۆت و بەندی سەر ئازادییەکەم نابینم .. بە پێچەوانەوە پێم وایە کەرەستەن بۆ ئازادییەکەم ..

جەستە کەرەستەی ویستە بۆ گەشتن بە پێداویستییەکانی ..

تەنها لە کاتی نەخۆشیدا دەبێتە کۆت و بەند، کە بۆ ئەوەش خودا ئاوەزی پێ بەخشیوین تا بە تیمار کردن و نەشتەرگەری بەسەریاندا زاڵ بین ..

ئێمەش هەموو ڕۆژێک لەم گۆڕەپانانەدا بەرەو پێش دەچین ..

پاش ئەمانەش تەنها مەتەڵە ئەزەلییەکە دەمێنێتەوە .. لە پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خودادا .. چۆن مرۆڤ ئازادە لە کاتێکدا ئەو فەرمانی خودایە و هەرچی ئەنجام دەدات لە قەزا و قەدەری ئەوەوەیە، دواتر چۆن لێ پرسینەوەی لێ دەکرێت لە کاتێکدا هەڵەکانی لە قەدەردا بەسەردا سەپێنراوە .. ئەوەیش مەتەڵی قەدەرە کە ئایینەکان پێمان دەڵێن دوور بکەونەوە لە چوونە ناو ئەم باسەوە چونکە وەڵامەکەی تەنها بە ئاشکرابوون و ئیلهامێک لە ڕێگەی دڵەوە دەست دەکەوێت نەک ئاوەز .. وە بەندە لەسەر باوەڕی باوەڕدار نەک فەلسەفەی فەیلەسوف .. چونکە لەم بابەتەدا نە ئاوەز سوودی هەیە و نە فەلسەفەش ڕزگارمان دەکات ..

بەڵکو پێویستە دڵ تیمار بکرێت و هەستەکان ناسک بکرێتەوە تاکو پەردەکان بەرز ببنەوە و مرۆڤ بتوانێت بە چاوی بینایی نەک چاوی ئادەمیزادی ببینێت و زیندانی هەل و مەرجی سنوردار بە هۆکارەکان تێپەڕێنێت و تەماشای پشتییەوە بکات ..

چونکە وەڵامی تەواو پێویستی بە زانینی پەیوەندی ڕوحە لەگەڵ دروستکارەکەی کە ئەمەش بابەتێکی پەردە بەسەردا دراوە

بەڵام چەند وشەیەکی کەم هەیە دەتوانرێت وەکو ڕێنیشاندەری ڕێگاکە بوترێت ..

بەڵێ مرۆڤ ئازادە بەڵام ئازادییەکەی دروستکراوە واتە دراوە بە سەریدا ..

ئەمەش لەوە دەکات بڵێین کە ئەو بڕیاری ئازادی بەسەردا دراوە، ناچارە بە هەڵبژاردن و ئەمەش دەیخاتە نێوان دوو دۆخەوە

نە وەکو ئازادییە ڕەهاکەی خودا ئازاد و ..

نە وەکو ماددەی کوێریش زۆرلێکراو و ناچار ..

کاتێک دەڵێین ئاگر دار دەسوتێنێت ئەمە پەیوەندییەکی جەبری حەتمییە ..

واتە هەر دەبێت دار بسوتێنێت و بەرپرسیاریش نییە لێی ..

هەموو ماددەکانیش لەم جۆرە حەتمییەتەدا کۆت و بەند کراون .. مرۆڤ بەم رِاددەیە ناچار کراو نییە ..

وە بە رِاددەی ئازادی خوداش ئازاد نییە ..

بەڵکو لەو نێوانەدایە ..

سەرپشکە لەوەدا کە دەیزانێت و ناچارە لەوەدا کە نایزانێت ..

یاخود وردتر بڵێین سەرپشکێکی ناچارە لەیەک کاتدا .. هەر ئەمەشە ناوی دەنێین ئازادی ئادەمیزادی .. بۆیە ئەو بە رِاددەیەک بەرپرسیارە نەک بەرپرسیارییەتییەکی رِەها ..

هەروەک چۆن کاتێک دادوەر بریارێک دەردەکات و بارودۆخ و پاڵنەر و خەڵەتێنەر و فشارە دەروونیەکانیش لەبەرچاو دەگرێت و لەسەر بنەمای ئەمانە بریارەکان سووک یاخود توند دەکاتەوە ..

ئەو دادوەرە ئەزەلییەش کە هیچی لێ ون نابێت بەم جۆرە بریار دەدات ..

بەڵام مرۆڤ نا بەرپرسیار نابێت چونکە پێگەی ئەو وەکو پێگەی ماددەی کوێر نییە ..

خودا فەرمان بە ستەمکار ناکات ستەم بکات ..

بەڵکو تەنها دەزانێت کە ئەو لە داهاتوودا ستەم دەکات چونکە زانیاری ئەو پەی بە هەموو شتێک دەبات ..

جیاوازیش هەیە لە نێوان زانیاری پێشوەختە و زۆرلێکردن ..

خـودا ئـازادی پێبەخشـین و هـەر لـە ئەزەلـەوە دەزانێت ئێمـە بـەم ئازادییـە چـی دەکەیـن ..

هــەر ئەویشــە پێمــان دەفەرمێــت کــە بارودۆخــی هیــچ گەلێــک ناگۆڕێــت تــا خۆیــان نەگــۆڕن ..

وە بـە پێغەمبەرەکـەی دەفەرمێـت .. زۆرلێکـردن لـە ئاییـندا نییـە ..

چونکـە ئـەو خـۆی دەسـتێوەردان نـاکات و پێشـی خـۆش نییـە کـەس دەسـت وەربـدات و ناخـەکان ناچـار بـکات بـە شـتێک لـە دەرەوەی ویست و سروشـتی خۆیـان .. چونکـە ئەمـە یـەک ناگرێتەوە لەگـەڵ پیـرۆزی ئـەو ئازادییـەی بـۆ مرۆڤەکانـی ویسـتووە ..

کەواتە ئازادی ڕاستەقینەیە ..

وە لەبەرئــەوەی ئــەم ئازادییــە ویســتی خودایــە کەواتــە لەیــەک کاتــدا زۆرکــردن و هەڵبژاردنیشــە ..

بەڵکو سۆزی خودایی لەوەدایە کە ناخ ئاسانکاری لە ڕەگەزی سروشـتەکەیا ببینێـت ((هەمـوو مرۆڤێـک ناچـارە لـەو شـتەی کـە بـۆی دروسـت کـراوە)) ..

ئەمــەش دەســتێوەردانی خودایــی ناکاتــە دژی ئــازادی بەڵکــو دووپاتــی دەکاتــەوە ..

هەموو کەسێک هەموو ئەو بارودۆخە ئاسانکراوانەی بەردەستە کە بەهۆیانەوە گوزارشت لە پێکهاتەی دەکات و خۆی بە چاک و خراپ دەسەلمێنێت .. تا ئەوە بێت کە هەیە ..

وەلێ چۆن خودا یەکێک دروست دەکات ستەم بکات هەروەک یەکێک دروست دەکات دادپەروەر بێت، ڕاڤەکەی ئەوەیە ویستی خودا ڕەهایە و وەکو چۆن ( خۆشەویست ) ی دەوێت ئاواش ( بێزراو ) ی دەوێت ..

بەڵام دادپەروەرییەکەی وای خواست کە ئەو کەسەی خۆشی دەوێت هەڵبژێرێت بۆ ئەو کارەی خۆشی دەوێت و ئەو کەسەش ڕقی لێیە بۆ ئەو کارەی ڕقی لێیە ..

خراپەکاری بۆ ستەم هەڵبژارد و چاکەکاریش بۆ دادپەروەری ..

خۆ ئەگەر خراپەکاری بۆ دادپەروەری هەڵبژاردایە و چاکەکاریش بۆ ستەم ئەوا هەموو تەرازووەکان سەراوژێر دەبوونەوە کە ئەمەش مەحاڵە چونکە ئەو لە دادپەروەریدا کامڵە ..

ئەمانە تەنها چەند ئاماژەیەکن .. وەلێ کەماڵی زانست کاری بیناییە .. ئەو شوێنەی کە وشەی ئاسایی و ئایەخ و دووبارە دەست نادات ..

وە ئاشکراکردنی هەموو لایەنەکانی مەتەڵەکە و درک پێکردنی ژێری دژ یەکەکە و .. ئەوەی چۆن مرۆڤ لەیەک کاتدا سەرپشک و ناچاریشە .. پەیوەستە بە هەوڵدان و کراوەیی دڵ و ڕوونی ڕوحەوە نەک زانستەکانی قسەکردن و بیر و باوەڕ ..



## نووستن

کاتێک تۆ دەخەویت .. دەگۆڕێیت بۆ درەختێک ..

دوگمەیەکی کارەبایی لە مێشکدا هەیە کە لە کاتی خەودا دەکوژێتەوە و .. تاریکایی و بێهۆشی باڵی بەسەردا دەکێشن و .. کەسایەتی بە دۆخێک لە نوقم بوون دا دەڕوات و مرۆڤ دەگۆڕێت بۆ درەخت .. بۆ ڕووەکێکی سەرەتایی .. بۆ شتێک ژیان تێیدا لەسەر شێوەی چەند فرمانێک بەردەوام دەبێت .. سوڕی خوێن دەڕوات .. هەناسە لەرەلەر دەکات .. ڕیخۆڵەکان هەرس دەکەن .. هەموو ئەمانەش بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بە ئەنجام دەگەیەندرێن لە کاتێکدا جەستە بە بێ هیچ جوولەیەک ڕاکشاوە .. ڕێک وەکو ڕووەکێکی چێندراو لە زەویدا کە شلەی پیادا دەڕوات و خانەکان گەشە دەکەن و لە ئۆکسجینی هەواوە هەناسە دەدات ..

ساتێکی نامۆیە جەستە تێیدا دەکەوێتە چاڵی ماندوویی و بێ تواناییەوە .. ئەستەم دەبێت بۆی گوزارشت لە ڕوح و مەعنەوییاتە بەرزەکەی بکات بۆیە پشوویەک وەردەگرێت و .. ملیۆنەها ساڵ دەگەڕێتە دواوە .. تا ژیانێکی سەرەتایی بژی هەروەکو چۆن ڕووەکەکان دەژیان .. ژیانێک لە پشوو کە پێویستی بە هیچ هەوڵ و کۆششێک نییە ..

نهێنی مەرگ لە خەودا شاردراوەتەوە .. چونکە خەو نیوەی ڕێگەیە بەرەو مردن، نیوەی مرۆڤی بەرز لە خەودا دەمرێت .. کەسایەتی دەمرێت .. ئاوەزی دەمرێت و .. دەگۆڕێت بۆ بوونەوەرێکی بێ بایەخی وەکو ئیسفەنج و قەوزەی سەر بەرد، هەناسە دەدات و گەشە دەکات بە بێ ئاگایی .. هەروەک بڵێیت ڕوحی لەدەست داوە ..

نیوەی ڕێگا بەرەو خۆڵ دەبڕێت و .. ملیۆنێک ساڵ دەگەڕێتە دواوە ..

ئاوەزی بە ئاگای دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە ناوەکییەکەی و .. کەسایەتییە بە ئاگاکەی دەگەڕێت بۆ ئەو سەرچاوە سروشتییەی لە بێهۆشیدا وەکو شلەی ناو نیانی درەختەکان کار دەکات .. وە مرۆڤ دەگات بە خامە سروشتییەکانی .. بە جەستە و گڵ و مادده و بەشە نەستییەکەی بوونی ..

شاعیران دەڵێن ساتەکانی ڕۆژ ڕووکەشین چونکە ڕەنگە بریقەدارەکانی وریای دەڕفێنن .. وە ساتەکانی شەو قووڵن چونکە ئەم پەردە بریقەدارە ئەتک دەکات و کۆت و زنجیرەکانی وریای

دەکاتــەوە و ڕۆ دەچێتــە قووڵایــی شــتەکانەوە ..

منیـش دەڵێـم سـاتی خەواڵویـی قووڵترینـی سـاتەکانە چونکـە پەردەیەکـی تـر ئەتـک دەکات ئەویـش پـەردەی ئاشـناییە ..

خەواڵویی ئاشنایی نێوان مـن و شـتەکان دەسـڕێتەوە و دەیانـکات بـە شـتی نامـۆ و سـەیر و سـەمەرە کـە هەندێـک جـار دەمانخاتـە نـاو کۆمەڵێک پرسـیارەوە ..

کاتێـک لـە ژووری نوسـتنەکەمم سـەیری چـواردەوری خـۆم دەکـەم لـە نێـوان خـەو و ئاگایـی دا .. بـە چرپـەوە دەڵێـم : مـن لـە کوێم ؟ .. مـن جێگای نوسـتنەکەی خـۆم ناناسـمەوە .. دۆلابەکـەم ناناسـمەوە .. بـە تـەواوی ئاشـناییم لەگـەڵ ژوورەکەمـدا نامێنێـت و بەلامـەوە نامـۆ دەبێـت ..

ئـەم ساتە قووڵـە .. چونکـە ئـاوەز لـە چوارچێـوەی بارودۆخەکـەی دەردەچێـت و بـە تـەواوی لـە ئاشـنایی نێـوان مـن و ژوورەکـەم قوتـاری دەبێـت، بۆیـە نامـۆ دەردەکەوێـت .. دووبـارە ئـەم سـاتە قوڵـە .. چونکـە ئـاوەز لـە چوارچێـوەی بارودۆخەکـەی دەردەچێـت و قوتـاری دەبێـت لـە ئاشـنایی و ڕاهاتـن و ڕێکارە ئاساییەکان و سـەر لەنوێ تەماشـای دەوروبـەری دەکاتـەوە .. تـا ڕێـکاری نوێـی ئازادتـر و ئیلهـام بەخشـتر دابنێـت ..

پێغەمبەرانیـش لـەم سـاتەدا ئیلهامەکانیـان وەردەگـرت .. وەک بڵێیـت لـە نێـوان خـەو و ئاگاییـدا سروشـیان پـێ دەگەشـت ..

نیوتـن لـەم سـاتەدا یاسـای کێـش کردنـی دۆزییـەوە .. کاتێـک بـە

چاوێکـی خەواڵـووەوە تەماشـای سـێوێکی کـرد لـە دارەکـە کەوتـە خـوارەوە .. هەسـتی کـرد کەوتنـە خـوارەوەی ئـەم سـێوە ئاشـنا و ئاسـایی نییـە و .. ناکرێـت سـێو بکەوێتـە سـەر زەوی .. بەڵکـو ئـەوە زەوییـە دەبێـت کێشـی بـکات ..

وە هەمـوو داهێنـەر و نووسـەر و دانـەر و شـاعیر و بیرمەنـدان .. بیریـان لـەم سـاتەدا چـڕۆی کـردووە .. چونکـە ئـەو سـاتە شـڵۆقەیە کـە تیایـدا ئاشـنایی و ڕاهاتـن دەکەوێـت .. و ژیـان بـە سـەیر و سـەمەرەیی دەدرەوشـێتەوە و ..ئـاوەز بریسـکەی پرسـیارگەلێکی تـەواو نـوێ لـێ دەدات کـە ئەگـەر لـە تـەواوی ئاگایـی و تـەواوی پەیوەنـدی لەگـەڵ شـتەکاندا بوایـە، ئـەو پرسـیارانەی نەدەبـوو ..

جیـاوازی نێـوان بلیمـەت و پێغەمبـەر لـەم سـاتەدا بریتییـە لـە ڕووبـەری ئـەو بینایـیـەی بـۆ هـەر یەکێکیـان ئاشـکرا دەبێـت ..

پەیامبـەر وەکـو ئامێرێکـی تەلەفزیـۆن وایـە کە ملیۆنێـک دەمەوانەی هەیـە .. ڕووبـەری بینایـی زۆر فراوانـە و .. توانـای وەرگرتنی گەورەیە .. دەتوانێـت وێنـە لـە مەریخـەوە وەربگرێـت لەسـەر شاشـەیەکی پانۆڕامـای پـان چونکـە ئـەو پاڵپشـتە بـە هـۆکارە خودایـیـەکان ..

بلیمەتیـش ئامێرێکـی ترانزسـتەری بچووکـە کـە بـە سـەختی لـە سـعودیەوە گوێـی لـە وێسـتگەی قاهیـرە دەبێـت .. چونکـە ئـەو پشـت بـە هـەوڵ و کۆشـش و خەیـاڵ و بیـر دەبەسـتێت کـە دەکرێـت بپێکێـت و دەکرێـت هەڵـەش بـکات ..

بەڵام هەردووکیان شان بە شانی یەک لە دەریای ڕاستییەکاندا مەلە دەکەن ..

❊❊❊

خەویش لە حەقیقەتیدا ئاگاییەکی قوڵە .. تیایدا فرمانە ڕەسەنەکان بە خەبەر دێت .. سوڕی خوێن ڕێک دەبێت و .. هەناسە ڕێک دەبێت و .. چالاکییەکانیان لە خەونەکاندا بڵاو دەکەنەوە و .. هەوەسەکانی لە شانۆیەکی ئاماژەیی نادیاردا دەخەنە ڕوو، کە هیچ کەس جگە لە خاوەنەکەی ناتوانێت هێما و ئاڵۆزییەکانی بکاتەوە ..

پاش ئەمە خەو دەچێتە قۆناغێکی قوڵترەوە .. ئەویش خەوی قورسە .. قۆناغێکە بە تەواوی خاڵی دەبێتەوە لە هەستەکان و .. خاڵی دەبێتەوە لە خەونەکانیش .. قۆناغێک لە تاریکی و .. نەبوونی ( عەدەم ) و .. چاڵێکی زۆر دووربن و .. ڕووبەرێکی سڕاوە لە ژیان .. کە نە ئاگایی تێدایە و نە کات و .. شوێن .. دە کاتژمێر تێیدا وەکو چاو تروکانێک دەڕوات .. بە بێ هەست کردن بە ماوەکەی .. هەروەک بڵێیت پەتی تەمەن کت و پڕ پچڕاوە .. هاوشێوەی ئێمە کاتێک شریتی تۆمارکردن دەبڕین و دووبارە دەیگەیەنینەوە بە یەک تا ڕەوتی قسەکردنەکە بەو جۆرە بێت کە خۆمان دەمانەوێت ..

سیاق و چوارچێوەی کات لە خەودا سەیرە ..

کاتێکی دیکەی جیاوازە لە کاتی کاتژمێر .. ڕەنگە خەونێک ڕووداوی ساڵێکی تەواو لە خۆ بگرێت هەر لە خۆشەویستییەوە بۆ هاوسەرگیری و تا جیابوونەوە و تا تاوان، لەگەڵ ئەوەشدا بە ژمارکاری کاتژمێر چرکەیەک زیاتر ناخایەنێت .. هەندێک جاریش پێچەوانەی ئەمە ڕوودەدات، دە کاتژمێر بەسەر نووستووەکەدا تێپڕ دەبێت کەچی ئەو وا دەزانێت میلی کاتژمێرەکە تەنها چەند خولەکێکی کەم جووڵاوە ..

لە کاتی خەودا .. کات کۆت و بەندی کاتژمێر لە کۆڵ خۆی دەکاتەوە و .. ملکەچی ئەندازە گیرییەکی دی دەبێت ئەویش ئەندازە گیری ئەندێشەیە کە لەسەر بنەمای قەرەباڵغی بە ڕووداو و ئارەزووەکان، فراوانی دەکاتەوە و تەسکی دەکاتەوە ..

ئەمیان لە دروستکراوی نووستوەکەیە و .. کاتێکی خودی پەتییە ..

نووستوو وەکو ئەو هونەرمەندە وایە کە چیرۆکێک دادەڕێژێت .. هەر چۆنێک بیەوێت کاتی چیرۆکەکە دروست دەکات و .. لە بوتلێکی خەیاڵی خەیاڵ پڵاوەکانیدا دەژی .. پاڵی لێدەداتەوە و هاوار بەو ئارەزووە دەکات کە حەزی لێ دەکات .. لە ئازادییەکی ڕەهادا کە دەگاتە ئاستی بێ مانایی ..

زۆربەی خەونەکانمان سەر لەبەری بێ مانایییە .. ئاواتگەلێکی مەحاڵن .. بەڵام کاتێک نووستووین بە دڵی خۆمان لەو ئاواتانەدا دەژین ..

نووستن هەرزانترین شێوەکانی ژیانە لە ڕووی تێچووەوە ..
چونکە ئەو بڕەی شەکر و ئۆکسجین کە نووستو پێویستی
پێیەتی بۆ بەردەوام بوون لە ژیان، زۆر کەمترە لەو بڕەی لە
کاتی ئاگاییدا پێویستییەتی ..

وە ئەو مرۆڤەی سەد ساڵ لە نێوان خەو و ئاگایی دا دەژی
دەتوانێت سێ سەد ساڵ بژی ئەگەر هەموو کاتەکە بخەوێت ..

***

وە ماددەی نووستن زۆر هەرزان بەهایە .. چونکە مرۆڤ لە گڵ
نزیک دەبێتەوە و .. دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئۆتۆماتیکییە کیمیاییەی
بە زگماکی هەر لە سەرەتای ژیانەوە لە خانەکانیدا هەیە ..

## کیمیای ژیان

له نێوان مەرگ و ژیاندا .. دەزوویەکی باریک هەیە ..

کاتێک پێش ملیۆنەها ساڵ ژیان لەسەر شانۆی دونیا دەستی پێکرد .. شانۆکە زۆر جیاواز بوو لە دۆخی ئێستای .. ئەوکات زەوی گەرم بوو و کەش بە هەڵم قورس بوو بوو .. ئۆکسجین بەم جۆرە زۆر نەبوو بەڵکو دەگمەن بوو .. وە گازە بەربڵاوەکان بریتی بوون لە هایدرۆجین و ئەمۆنیا و میسان و یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن .. تروسکایی هەورە بروسکە و گرمە گرمەکەی .. تیشکی سەروو بنەوشەیی و تیشکی ئەتۆمی و بارگە کارەباییەکان لە زەوی نەدەبڕان ..

ئاوەکان ڕووبەرێکی فراوان لە گۆماوە تەنکەکانیان لێوانلێو دەکرد و .. وەکو ئاوە بە خوڕەکانی ئێستا سازگار نەبوون و قەوزە سەوزەکان سەری نەدەکەوتن .. بەڵکو ئاوێکی لێڵ و چڕ

بوو هەروەکو شلە .. پڕ بوو لە خوێیەکانی فسفۆڕ و کالسیۆم و سۆدیۆم و پۆتاسیۆم و ئاسن و گۆگرد ..

لەم شانۆ کیمیاییە چالاکەدا .. ژیان دەستی پێکرد .. لە بەرئەوە هەردەبێ برێک باس و خواسێک لە کیمیا بکەین .. وە دەبێت خوێنەر لە گەڵماندا بەرگەی شەکەتی گەشتی ناو نەزاندراوەکانی جیهانی کیمیا بگرێت .. گەر بیەوێت نهێنی بوونی بزانێت ..

تاقیگەکان توانیویانە بیسەلمێنن کە تا ڕاددەیەک ماددەی ژیانی هەموو بوونەوەرە زیندووەکان یەکێکە .. وە جیاوازییەکانی نێوان پێکهاتنی گۆشتی گوێدرێژ و گۆشتی نەوەی ئادەم و گۆشتی مردوو .. جیاوازیگەلێکی کەمە و شایەنی باس نییە .. وە هەموو ئەو ماددانەی بنیاتی زیندوویان لێ پێک دێت لە سنووری شەکرەکان و نیشاستە و چەوری و پرۆتینەکان دەرناچن ..

هەروەها تاقیگەکان توانیویانە ئەوەش بسەلمێنن کە کۆی ئەم ماددانە ئاڵۆزبوونی پێکهاتەیی جیاوازی یەک ماددەن ئەویش هایدرۆجینە .. هەموو ماددە زیندووەکان لێوەرگیراوی ماددەیەکی هایدرۆکاربۆنین .. لە گازی میسانەوە .. ئەویش گازێکە لە کاربۆن و هایدرۆجین پێک دێت .. کەواتە ئەو شتە جادوییە چییە کە بە دیاریکراوی ماددەی کاربۆنی کردووەتە ماددەی هەڵبژێردراو بۆ پێک هێنانی ژیان ..

نهێنییەکە ئەوەیە ئەم ماددەیە شلۆق و ناجێگیرە .. نا تێرە .. ئامادەییەکی بێ کۆتای هەیە بۆ یەککگرتن لەگەڵ ژمارەیەکی نا

کۆتـای ئاوێتـەکان و هاوبەش کـردن بـە گەردیلـەکان لـە گەڵیانـدا .. هەمـوو کاتێـک ..

وه سـەلمێنراوه کـە ئـەو مـادده جێگیرانـەی لـە کیمیـادا پێیـان دەوترێـت مـادده خانەدانـەکان هاوشـێوەی ئاڵتـون و پلاتیـن و گازی هیلیـۆم و ئارگـۆن و کریپتـۆن .. مـاددەی لـە کارکەوتـووی تەمبەڵـی وەکو شازاده تەممەڵەکانـن .. دەسـتیان پـێ کـرد و تـەواو بـوون بـە بـێ ئـەوەی هیـچ توانایەکـی نـوێ بـدەن بـە دەسـتەوە .. هۆکارەکەشـی ئەوەیـە گەردیلەکانـی ئـەم ماددانـە تێـر و هاوسـەنگ و جێگیـرن تـا ئاسـتی مـردن ..

.. بۆیـە هیـچ یـەک لـەم توخمانـە نەچوونـە پێکهاتـەی جەسـتەی زینـدووەوه .. بەڵکـو ژیـان یـەک مـاددەی هەڵبـژارد بـۆ جێگیـری خـۆی، ماددەیەکـی شـڵۆق و کـەم و کـوڕ و ناتێـر .. ماددەیـەک کـە بڕێکـی زۆر هەڵوەشـان و یەکگرتـن لەگەڵ ماددەکانـی چواردەورەکەیدا دەکات ..

ئەویـش مـاددەی کاربۆنـە .. چونکـە عەمبـاری وزەیەکـی ناکۆتـای کیمیایـی و جێگـەی ژمارەیەکـی بێشـوومارى کارلێکەکانـە ..

خـودی ماددەکـە سـیفەتەکانی ژیانـی تێدایـە .. چالاکـی و گـۆڕان و زۆربـوون و ئاڵـۆز بـوون ..

کلیلـی ژیـان .. کاربۆنـە .. چونکـە ماددەیەکـی برسـی ناتێـرە، لـە خولگـەی ئەتۆمیـدا چـوار ئەلکترۆنـی کەمـە تـا بگات بە هاوسـەنگی و پشـوو .. هـەر بۆیـە بـەردەوام لـە هەوڵی گەشـتن بەم هاوسـەنگییەدا

دەچێتـە پەیوەنـدی و کارلێکەکانـەوە و .. ئەنجامـی ئـەم کارلێکانـەش چەنـد بـەدوای یەکدا هاتنێکـی کیمیاییـن کـە قەتیـس ناکرێـن .. بـە گازی میسـان و هایدرۆکاربـۆن دەسـت پێـدەکات تـا دەگاتـە مـاددە کاربۆهیدراتییەکانـی وەکـو شـەکر و نیشاسـتەکان .. بـۆ گلسـرین و چەورییـەکان .. وٚ تـا پرۆتینـەکان ..

ئـەم زنجیـرە زینـدووە پێکهاتـەی ئاڵـۆز کـراو و لێوەرگیـراوی یـەک مـاددەن ئەویـش کاربـۆن یاخـود خەڵـوزە ..

(میللـری)ش هەسـتا بـە لاسـاییکردنەوەی بارودۆخـی ژیانی یەکەمی لـە تاقیگـەدا، خاڵـی کردنەوەیەکـی کارەبایـی ئەنجامـدا لـە کەشـێکی بـێ ئۆکسـجین و پـڕ لـە میسـان و کلۆریـدی ئەمۆنیـۆم و هەڵمـی ئـاو .. سـەرەنجام کۆمەڵێـک ئاوێتـەی ئەندامـی سەرسـوڕهێنەر بەرهـەم هـات لـە ناویشـیاندا ترشـە ئەمینییـەکان .. کـە ئەوانیـش ناوکـی پرۆتینەکانـن ..

هەڵبژاردنـی کاربـۆن بـە تایبەتـی لەلایـەن ژیانـەوە، وەکـو ئـەو خشـتەی بینـا سـازییەکەی پـێ بنیـات دەنێـت، هەڵبژاردنێکـی دانایانەیـە .. چونکـە کاربـۆن توخمێکـی چالاکـە .. ئەگـەرە کیمیاییەکانـی سـنوریان نییـە .. هـەروەک بـە ژمـارکاری سـەلمێنراوە کـە ئـەو گـەردەی بیسـت گەردیلـە کاربـۆن لـە خـۆ دەگرێـت دەتوانێت یـەک ملیـۆن ئاوێتـەی نـوێ بـدات بـە دەسـتەوە ..

کاربـۆن توخمێکـە هاوشـێوەی ژیـان .. بەسـەر چەندیـن ئاسـۆی ناکۆتـادا کراوەتـەوە .. گەردیلەیـەک کەمتـر و گەردیلەیـەک زیاتـر لـە میسـان دەبێتـە ئاوێتەکانـی کلوروفـۆم .. کهـول .. نفتالیـن ..

پترۆڵ .. و هتد .. ملیۆنەها مادده .. هەر ماددەیەکی ئەندامیش ئاوێتەی خۆی هەیە ..

شەکری قامیش و شەکری میوە و شەکری جۆ هەموویان ئاوێتەی ئاڵۆزن لە شەکری ترێی سادە، گلوکۆز ..

وە زەیتی زەیتون و زەیتی تۆوی لۆکە و زەیتی پاقلەی سودانی و زەیتی ماسی و بەزی بەراز و بەزی مانگا .. هەموویان ئاوێتەی ئاڵۆزن لە گلیسرین و ترشە چەورییەکان ..

وە بەهەمان شێوە ماددەی نینۆک و ماددەی پێست و ماددەی قژ و ماددەی ئێسک و کرکراگە و ماسولکە و دەمار و خوێن و پەڕ و باڵ و توێکڵی مێرووەکان و سپێنەی هێلکە و هۆرمۆنەکان .. هەموویان ئاوێتەی ئاڵۆز و لێوەرگیراوی جیاوازی ماددەی پرۆتینن ..

هەروەها ئەو جۆرانەی پرۆتین کە لە (٢٤) ترشی ئەمینی پێک دێت توانایەکی پێدەدات وەکو ئەو توانایەی (٢٦) پیتەکە دەیدەن .. توانای بەخشینی هەزارەها وشە و ملیۆنەها ڕستە .. هەر ڕستەیەک جیاواز لەوی دی چونکە (٢٤) پیتی کیمیایی لە ژێر دەستدایە و بە ئارەزووی خۆی پێکهاتەیان لێ دروست دەکات ..

وە گرنگترین ماددەی زیندوو پرۆتینە چونکە گەردی پرۆتین قورسە و ناوەندی گەردیلەکانی زیاتر لە پێنج هەزار گەردیلەیە .. بە شێوازێکی سەرسوڕهێنەر فرە ئەگەرە ..

گەردیلەکانی ماددەی پرۆتین بە تەنها توانای جۆربەجۆر لە دروستکردنی کیمیاییدا نابەخشن .. بەڵکو لە پێکەوە لکانیشیاندا شێوەی جۆراوجۆری پێکەوە لکاو بەرهەم دەهێنن .. هەندێک جار بە شێوەی کۆبوونەوەی خڕۆکی پێکەوە دەبەسترێن هەندێک جاریش بە شێوەی زنجیرەی لولپێچی .. هەندێک جاری دیکە لەسەر شێوەی پەتی پڕی وەکو وایەری تلگرافی دەبن و هەموو جارێکیش دەبنە شێوەیەکی پێکهاتەی نوێ لە فەرمان و تام و بەرکەوتنی دا، لەگەڵ ئەوەی پێکهاتەکە لە هەموویاندا هەر یەکێکە ..

***

ئەو پرسیارەی دیکەش کە بە خەیاڵی کیمیاییەکاندا هات .. ئاوە .. نهێنی ئاو ..

بۆچی وا دەردەکەوێت هەموو ژیان لە ئاودا پەرژین درابێت ..

بۆچی ئاو بەشی هەرەزۆری شانەی زیندوو پێک دەهێنێت .. وە بۆچی مەرجی هەموو بونیادێکی زیندووە ..

لە قوتابخانە وا فێر کراوین کە ئاو نە تامی هەیە و نە ڕەنگ و نە بۆن .. ئەمەش گەورەترین درۆیە ..

چونکە ئاو چالاکترینی شلەکانە و پێکهاتەکەی ئەوپەڕی شڵۆق و ناجێگیر و نا تێرە ..

پشـكنينى ئەتۆمـى ئـاو سـەلماندوويەتى كـە گەرديلـەى هايدرۆجيـن لەگـەردى ئـاودا ڕووت و بـێ ئەلكترۆنـە .. هـەر بۆيـە زۆر تامەزرۆيـە بـۆ وەرگرتنـى ئەلكتـرۆن لـە هـەر ماددەيـەك كـە بـەرى دەكەوێـت .. هـەر ئەمەشـە نهێنـى توانـاى ئـاو بـۆ تواندنـەوەى مـاددەكان و كارلێـك كـردن لـە گەڵيانـدا و هەڵوەشـاندنەوەيان بـۆ ئايۆنەكانيـان ..

ئـاو تەمبـەڵ و تـەوەزەل نييـە .. بـێ تاميـش نييـە .. بـێ چالاكـى نييـە ..

ئـاو .. هاوسـەنگييە كارەباييەكـەى ناتـەواوە .. بۆيـە تينوويەتـى دەڕەوێنێتـەوە چونكـە تامێكـى زينـدووى هەيـە .. بـە بەڵگـەى ئەوەى ئـاوى قورسـى تێـر تينوويەتـى ناشـكێنێت .. وە ئەگـەر جامێكـى لـێ بخۆيتـەوە تينوويەتـى لەنـاوت دەبـات ..

ئـاو كارێكـى ديكەشـى هەيـە .. مـاددەى پرۆتيـن دەگۆڕيـت بـۆ چەنـد بارسـتاييەكى هەنـاوى جەلاتينـى لـە بارێكـى يەككرتوويـى كارەباييـدا كـە نـە كڵـۆ دەبێـت و نـە لەيەكيـش جيـا دەبێتـەوە .. بەمـەش خامێكـى زينـدووى زۆر هەسـتيار و ناجێگيـر و شـڵۆق و .. گۆڕانـكارى دروسـت دەكات ..

ئـەم توێژينەوەيـە لـە كۆتاييـدا بۆمـان دەسـەلمێنێت كـە مـاددەى ژيـان، ژيانـى تێدايـە .. سيفەتەكانى ژيانـى تێدايـە .. وە پێكهاتنـى ژيـان لـە ئاوێتەكانـى كاربـۆن و ئـاو ڕێكەوتێـك نەبـوو .. وە ئەگـەر ژيـان لـە كاربۆنـەوە پێـك نەهاتايـە ئـەوا لـە كاربۆنـەوە پێـك دەهـات !

وە ئەگەرەکە لەوە گەورەترە کە تەنها کارێکی هەڕەمەکی بێت

بەڵکو پێویستییە ..

ئەمەش وامان لێ دەکات بپرسین .. ماددە چییە ؟ ..

وە حەقیقەتەکەی چییە !!؟



# تاکە ڕاستەکە

هەموومان لە یەک باوکین ..

کۆتا کەسی دونیا تاکە ڕاستەکەیە ..

دەتوانرێت دابەشبکرێت بۆ دووان پاشان بۆ چوار و هەشت و شانزە و سی و دوو .. و شەست و چوار و هتد .. و هتد ..بۆ ناکۆتا و هەموو ئەو ژمارانەت دەداتێ کە هاتووە و دێ بە بیری گەورە پیاوانی ژمارکاری لە ڕۆژانی ئیقلدیس و فیسا گۆرسەوە تا ئەنیشتاین .. ئەو تاکێکی ڕاست و سادەیە بەڵام لە هەناویدا هەڵگری هەموو ژمارەکان و ناکۆتاشە ..

ژیانیش بە یەکێک دەستی پێکرد .. تاکە خانەیەک دابەشبوو بوو بە دوو خانە و پاشان چوار و پاشان هەشت و پاشان هەزاران و ملیۆن و بلیۆنەها خانە و .. بە پێی ژینگەکان جۆراوجۆر بوون و هەموو ئەو خشۆک و باڵندە و پەپولە و کرم و مەیمون و ئادەمیزادانەی لێوە پەیدا بوو کە لە دەوروبەرمان دەیبینین ..

وە گەردوون بە تاکە گازێکی سادە دەستی پێکرد ئەویش هایدرۆجینە .. ئێستا ئەوە کە لە هەناوی ئەستێرەکاندا دەسوتێت تا هەموو بەیانییەک ڕووناکی و گەرمیمان لەگەڵ تیشکی خۆردا پێبدات ..

وە لە هەناوی فرنە ئەستێرەییە گەورەکانەوە و لە هایدرۆجینەوە ئاسن و مس و ئاڵتون و تەنەکە و گرافیت و کاربۆن و سلیکۆن و جیوە و یۆد و کۆی ئەو توخمانەی بە تاکی و بە یەکگرتوویی لە دەوروبەرماندا دەیانبینین هاتن .. ئەو توخمانەی لە شێوەی ئاوێتە و کەرەستەی یەکەمی و بەرد و خۆڵدا دەیانبینین ..

سەیریش ئەوەیە هایدرۆجین خۆی پێک دێت لە تەنها یەک پرۆتۆن و یەک ئەلکترۆن بە دەوریدا دەخولێتەوە ..

وە هەموو ئەوەی لە هەناوی ئەستێرەکاندا ڕوودەدات ئەوەیە کە ئەم گەردیلەیە هەڵدەوەشێت تا ڕووناکی و گەرمی و تیشک بدات و لە شێوە و ڕێژەی نوێدا پێک بێتەوە .. جارێک H+۲ و جارێک H+۳ و جارێکی تر H+٤ .. هەموو جارێکیش توخمێکی نوێ بۆ بوون بەرهەم دێت ..

وە هەموو ئەوەی لە دەوروبەرمان دەیبینین لە پۆلی گاز و شل و ڕەقەکان هیچ نییە جگە لەو پێکهاتنانەی کە هەموو لە یەک بەشێکی تاکی ڕاست پێک هاتوون ئەویش هایدرۆجینە .. تۆش تاکێکی ڕاستی لە چاوی خۆتدا بچووک و سنورداری ..

بەڵام دەتوانیت هەست و درک پێکراو و زانیاری بێ سنوور لە خۆ بگریت .. تۆ زۆر لە جیهان بچووکتری لەگەڵ ئەوەشدا لە ناخدا هەموو جیهان دەگریتە خۆ و وێنای دەکەیت و خەیاڵی دەکەیت و دەیبینیت ..

لە تۆڕەی چاوەکانتدا وێنەیەکی ڕوون و ورد بۆ خۆر و مانگ و ئەستێرە و مەجەڕڕەکان دروست دەبێت ..

وە لە ئاوەزیشتدا نەخشەی گەردوون کورت دەبێتەوە لە کۆدێکی جەبری و هاوکێشە و ئاماژە و ژمارەگەلێکدا .. ژمارەگەلێک کە هەموو بۆنەیەک بۆمان دەسەلمێنن ژمارەی ڕاستەقینەن ..

ئەو هاوکێشانەی ژمێریارەکانی سەرزەوی خەیاڵی دەکەن کەشتییە ئاسمانی و موشەک و مانگەکان دەیسەلمێنن و دەزگاکانی چاودێری و ڕادارەکان بەڵگە بۆ ڕاستییان دەهێننەوە ..

ئەو تاکەی کە تۆیت .. بە کرداری گشتگیرە بەسەر ئەندازەی گەردوون و نهێنی و کلیل و داخەرەکانی لە ناخی خۆیدا ..

تۆی تاک و سنووردار نموونەیەکی بچوکراوەی ناکۆتا لە ناختدا لە خۆ دەگریت ..

وە هەموو ئەوەی لە بوندا هەیە لە دیاردە و ڕووەک و بێگیان و ئاژەڵ و مرۆڤ لە ڕاستیدا بەشەکانی تاکە ڕاستەکەن .. چاکەکاری و خراپەکاریش وەکو ڕووناکی و سێبەر وان لە یەک تابلۆدا .. هەریەکەیان تەواوکەری ئەوی ترە و پێویستە بۆ یەکگرتوویی تابلۆکە ..

هەریەک لە ئێمە ئاواز و ڕستەیەکی مۆسیقین لە سەمفۆنیایەکی تەواو کەردا ..

ئازار هەستی هەڵچوونە ..

ئەشکەنجە هەستی هەڵچوونە ..

تۆ ئازار دەکێشیت کاتێک خۆویستانە لە هەمووان جیا دەبیتەوە و لە بیری دەکەیت کە تۆ پیت و ڕستەیەکی لە ئایەتی بوونی گەورەدا وەلێ ئەگەر بە هەستێکی سۆزدارانە و گەرم و گوڕ بە ئاڕاستەی بوون بڕۆیت .. هەستی ڕەچەڵەکی و خزمایەتی .. ئەوا هەست دەکەیت کە دەتوانیت برایەتی لەگەڵ شێردا بکەیت و هاوڕێیەتی چەقەڵی دارستان بکەیت و .. ڕێوی و مارەکان دەستەمۆ بکەیت و یارییان لەگەڵ بکەیت و یاریت لەگەڵ بکەن هەروەک بڵێیت خێزانی تۆن .. ئەمە چونکە گەردوون هەمووی هەر ڕووی جیاوازی تاکە ڕاستەکەیە ..

هەمووومان خزمین ..

تۆی بکوژ و کوژراوەکە ..

تۆی گورگ و نێچیرەکە ..

تۆی زەبر لێدەر و زەبر لێدراوەکە ..

جیاکەرەوەی کات و شوێنیش هیچ نییە جگە لە وەهمێک لە وەهمەکان ..

وە دەبێـت بـە چـاوی ویژدانـت ئـەم جیاکـەرەوە وەهمیانـە تێپەڕێنیـت تـا برایەتـی و ڕەچەڵـەک و خزمایەتـی نێـوان خـۆت و هەمـوو شـتەکانی دێ ئاشـکرا بکەیـت .. وە بـۆت دەربکەوێت کـە ژیانـی ڕاسـتەقینەی تـۆ لـە فەنا بوونتدایـە لـە هەمـوو ئـەوەی تیایـدا دەژیـت .. چونکـە تـۆ بەمـە تاکـی و حەقیقەتـی خـۆت بـە دەسـت دەهێنیتـەوە ..

تـۆ یەکێکـی لـە یەکینەکانـی یەکـی گـەورە و .. هـەر جەنگێـک ڕابگەیەنـی بەسـەر خۆتـدا ڕایدەگەیەنیـت و، کـە دەکوژیـت هـەر خـۆت دەکوژیـت ..

ئـەو خۆشەویسـتییەش کـە هـۆز و کۆمەڵگـە و وڵاتـەکان دروسـت دەکات هیـچ نییـە جگـە لـە هەوڵێـک بـۆ گەڕاندنەوەی بـۆ یەکگرتوویی ..

ئـەو کێشکردنەشـی لـە نێـوان ئەسـتێرەکاندایە و مەجـەڕڕە و هەسـارەکان دروسـت دەکات تەنهـا گەڕاندنـەوەی هەموانـە بـۆ تاکـە سیسـتمەکە .. هـەروەک ئـەو مەرگـەی لـە کۆتاییـدا دەمانگێڕێتـەوە بـۆ دایکـە زەویمـان تـا ڕووەکـەکان خۆراکمـان لەسـەر بخـۆن هـەروەک چـۆن ئێمـە خۆراکمـان لەسـەر ئـەوان دەخـوارد .. و تـا خواردنمـان ببێتـە خـوراو .. بیرخسـتنەوەیەی ئێمەیـە بـە حەقیقەتەکـە ..

هەروەهـا ئـەو ئاگـرەی هەموومـان دەخـوات و دەمانـکات بـە خەڵوز، درەختـەکان بـە خەڵـوز و .. مـارەکان بـە خەڵـوز و .. مەیموونـەکان بـە خەڵـوز و .. ئادەمیزادیـش هـەر خەڵـوز .. وە هەمـوو ژیـان هـەر بـە خەڵـوز .. ئاماژەیـە بـۆ بنەڕەتـە هاوبـەش و تاکەکەمـان ..

چونکە ژیان هیچ نییە جگە لە پۆلی جیاوازی یەک ماددە ئەویش کاربۆنە ..

هەموو گۆڕانکارییەک وێنە جۆراوجۆرەکانمان دەگێڕێتەوە بۆ تاکە ڕاستەکە .. ئەم دیاردە جیاواز و دژانە لە کۆتاییدا دەگەڕێتەوە یەکەیەکی سادە ..

وە هەروەک پێشتر وتمان کە بوونەوەری زیندوو سەدان جۆرە لە شانەی پێست و نینۆک و قژ و دان و ماسولکە و مێشک و جگەر و خوێن و ڕیشاڵەکان و هەموشیان گۆڕانەکانی یەک خانەی سادەن ئەویش خانەی کۆرپەلەیە ..

لە زەویشدا و لە یەک کێڵگەدا، هەر ئەو گڵە هەزار و یەک جۆر لە میوە و سەوزەوات و گوڵ و قەوزە و بەکتریا دەدات ..

هەموو لە یەکەوە دەردەچن ..

هەموانیش هەر بۆ ئەو یەکە دەگەڕێنەوە ..

وە هەروەک چۆن بە یەک دەنکە شقارتە لەپاڵ دەنکە شقارتەیەکی دیکە و لە پاڵ دەنکە شقارتەیەکی دیکەش سێگۆشە و چوارگۆشە و لاکێشە و دەمانچە و دواتر هەرەمێک و پاشتر شەش پاڵویەک و پاشان جۆری جیاوازی بیناسازی دروست دەکەیت .. بەهەمان شێوەش بوونی ئاڵۆزی چواردەورت دەگەڕێتەوە بۆ یەکەیەکی سادە ئەویش ئەو گەردیلەیەیە کە چووەتە پێکهاتەی بێ کۆتاوە و هەموو ئەو دیاردە جیاواز و دژانەی دروست کردووە کە دژایەتی یەک دەکەن و دەجەنگن و یەک دەخۆن و یەک

دەكـوژن و لـە كۆتايشـدا هەموويـان لـە يـەك باوكـن ..

يەكێكی ڕاستە ..

ژيـان و مـەرگ .. شـل و ڕەق و گازەكان .. تيشـكدانەوەكان .. هەموويـان پۆلەكانـی يـەك شـتن .. جيـاوازی نێوانيـان جيـاوازی ڕەچەڵـەك و پەيوەنـدی و چۆنيەتييـە ..

دوو گەرديلـە ئۆكسـجين ئـەو گازە ناسـكەت دەدەنـێ كـە هەڵيدەمژيـت ..

وە سـێ گەرديلـە ئۆكسـجين ژەهرێكـی كوشـندەت دەدەنـێ پێـی دەڵێـن ئـۆزۆن ؟

بەڵكـو هـەر ئـەو دوو گەرديلەيـە ئەگـەر بـە شـێوازێكی تـر و چۆنيەتـی جيـاواز ڕێكبكـەون ماددەيەكـی جيـاواز دەدەن بە دەستەوە ؟

جيـاوازی لـە چييەتيـدا لـە كۆتاييـدا دەگەڕێتـەوە بـۆ جيـاوازی پێكهاتـن و چەنـدی و چۆنييەتـی .. بـۆ ڕەچەڵـەك و ژمـارە و پەيوەندييـەكان ..

جيـاوازی نێـوان شـەكر و نيشاسـتە جياوازييـە لـە ڕيزبـوون و ژمـارەی ئـەو گەرديلانـەی هاتوونەتـە سـەر پێكهاتـەی ئـەو دووانـە بـەڵام دووانەكـە لـە يـەك مـاددەی ئەندامیـن ئەويش كاربۆهيدراتـە ..

وە جیاوازی نێوان ژەهری مار و نێوان ژەمێکی بەلەزەتی هێلکەی سوورەوەکراو جیاوازییەکی شێوەییە لە بینای گەردیلەکاندا .. چونکە هەردووکیان لەیەک ماددەن ئەویش پرۆتینە ..

هەموو گەردوونیش یەک شتە لە قاڵب و شێوە و پێکهاتەی بێشووماردا تێدەکرێن و دەڕژێنرێنەوە ..

بنەڕەتیش یەکێکی ڕاستە ..

جیاوازی نێوان شکسپیر و ئەو دەرگاوانەی لەبەردەم دەرگاکەتدا دەوەستێت و ئەو سەگەی کلکی لە بەردەمتدا بادەدات و .. ئەو ئەسپێیەی لەسەرتدا کەیف دەکات .. جیاوازییە لە ڕیز بوون و چۆنییەتی پێکهاتنی ترشە ئەمینییەکان لە بۆهێڵە بۆماوەییەکاندا ..جیاوازییە لە یەک ماددەدا ناوی دی . ئێن . ئەیە ( ترشی دایوکسی ڕایبۆنیوکلیک ) .. لە بیست و یەک ترسی ئەمینی پێک دێت کە دەکرێت ڕیز ببن بە شێوەی جۆراوجۆر هەروەک چۆن پیتەکان ڕیز دەبن .. جا سەردەکێشن بۆ بوونەوەری جیاواز هەروەک چۆن پیتەکان وشە و دەربڕینی جیاواز و دژ پێک دەهێنن ..

جیاوازییەکی شێوەیی چۆنیەتییە .. جیاوازییە لە ڕیز بووندا .. وە لە شێوازی یەک ماددەدا .. ئێمە لە بەردەم دروستکارێکی دەست ڕەنگینداین چەندین دیزاینی ( ڕوحی ) داهێناوە کە لە سەرە مەرگیاندا دەبنە یەک ماددەی سەرەتایی تا ژمارەیەکی بێشووماری یەکەکان ..

وە هــەروەک چــۆن لــە ٢٦ پیــت توانــراوە پــڕ بــە کتێبخانەکانــی زەوی زمان و زانست و زانیاری و هونەر و شارســتانیەتەکان دروست بکرێــن تەنهــا بــە ئاڵوگــۆڕ و گونجاندنــی پیتــەکان .. دروســتکاری ژیانیــش بەهەمــان شــێوە توانــای ئــەوەی داوە ئاڵوگــۆڕ و گونجانــدن لــە نێــوان ترشــە ئەمینییــەکان و پێکهێنانــی دیزاینــی داهێنەرانــە لــە یــەک مــاددە کــە نــاوی دی . ئێــن . ئەیــە ئــەو هەمــوو جــۆر و ڕەگــەز و تاکانــە بەرهــەم بهێنێــت کــە پــێ بــە زەویــدا دەنێــن لــە شکســپیرەوە تــا میکــرۆب و بــە هەمــوو ئــەو پۆلــی ئــاژەڵ و گیانلەبەرانــەی یــەک دەخــۆن و لــە بنەڕەتیشــدا یەکــن ..

وە زانایانــی سروشــت پێمــان دەڵێــن ئــەو جیاوازییــەی دەیبینیــن لــە ڕەنگەکانــی ســوور و ســەوز و زەرد و شــین، جیاوازییــە لــە درێــژی شــەپۆلەکانی ڕووناکیــدا .. تەنهــا جیــاوازی ژمارەییــە ..

وە جیــاوازی نێــوان تیشــکی ڕووناکــی و تیشــکی ئێکــس و تیشــکی گامــای کوشــندە و شــەپۆلە وایەرلێســەکانی ڕادیــۆ، بــە هەمــان شــێوە جیاوازییــە لــە درێــژە شــەپۆلدا .

درێــژی تیشــکی ڕووناکــی بــە مایکــرۆن و بەشــەکانی مایکــرۆن مەزەنــدە دەکرێــت

شەپۆلەکانی ڕاداریش بە ملیمەتر ..

وەلــێ خــودی دیاردەکــە هەریــەک دیاردەیــە پێــی دەڵێــن شــەپۆلە کارۆموگناتیسییەکان .. ئەنجامەکەش زۆر پشوودەر و دڵخۆشکەرە .. شــایەنی سەرســوڕمان و بیرکردنەوەشــە بــەو ئەندازەیــەی دڵخۆشــکەرە

.. جیاوازی نێوان من و تۆ و نێوان گوێدرێژ و قاڵبێک خشت لە کۆتاییدا جیاوازییەکی ژمارکارییە لە بیر و چۆنیەتی ڕیزبووندا .. جیاوازییەک کە دەتوانرێت بە ژمارە گوزارشتی لێ بکرێت ..

تا ئەوکاتەی ماددەی بوون ( زیندوو و مردوو ) دەتوانرێت بە ئاسانییەکی زۆر بگەڕێنرێتەوە بۆ یەک بنەڕەت با ناوی بنێین س .. ئەوکات گوێدرێژ دەبێتە ڕەگی دووجای ٣٤٣ س و جەنابیشت لۆگاریتمی س ص ١٩ و منیش دەبمە س ص ع ٢ .. کاتێک ص , ع ئاماژەن بۆ فاکتەرە چۆنیەتییە نادیارەکان کە لای ئێمە بەرامبەری ڕوح و ئاوەز و ویژدانە ..

هەموو جیهان پێکهاتەی یەک ماددەن ..

ئەوەش کە لە چواردەورمان دەیبینین جۆرەکانی هونەری پێکهاتنە و .. سەرەنجامی لێکدان و لێدەرکردن و کۆکردنەوە دابەشکردنی یەک شتن ..

وە وێنەی گەردوونی بەرچاوت و وێنەی حەقیقەتەکەی بە ئەندازەی توانای دابەشبوونی ئەو یەکەیە .. بە ئەندازەی توانای زیادکردنی بەشەکان تا لە نێوان خۆیاندا کۆکراوە و کەرت و ڕەگ و لۆگاریتم پێک بهێنن .. وە بەو ئەندازەیەی کە زانستی سێگۆشەکان و زانستی ژمارکاری جیاکاری و تەواو کاری دەتوانن ئەگەرە بێ کۆتاکانت پیشان بدەن .. ئەو ئەگەرانەی دەتوانن ئەم کردارە بیرکارییانە بەرهەم بهێنن ..

تەنها بڕ و چۆنیەتی و ئەندازە و سنوری بیرکارییانەن لەگەڵ درێژی دا کە کات و شوێن دابەشی دەکات بۆ ئەو وێنانەی ئێمە دەیانبینین ..

تۆش ئێستا پێدەکەنیت و دەپرسیت .. چۆن دەکرێت جیهان بە هەموو جوانی و ڕەنگە پڕ لە ژیانەکانیانەوە کورت بکەینەوە لە تەنها کۆدێکی بیرکارییانەدا .. لەگەڵ ئەوەی تۆ هەموو ڕۆژێک گوێ لە مۆسیقا دەگریت و لەرزت پیا دێ و مەست دەبیت، لەگەڵ ئەوەی ئەم مۆسیقایە لە ڕاستیدا هیچ نییە جگە لە پێشبڕکێیەکی ژمارەکان .. تەنها چەند لەرەلەرێکی یەک بەدوای یەکە کە بەرزی و نزمی و بەهێزی و لاوازییەکەی دەگۆڕێت بۆ ئەو شەپۆلە دەنگییانەی لە پەردەی گوێ دەدەن تەنها لەرەلەرن و لە بڕدا جیاوازن .. لە کۆتاییدا ژمارەن .. چۆنیەتین .. بینای مۆسیقی بە پلەی یەکەم بینایەکی ئەندازەییە .. وێنەیەکە لە بۆشاییدا ..

هەموو پارچە مۆسیقایەک هاوکێشەیەکی بیرکارییە و یاسای خۆی هەیە ..

لەگەڵ ئەوەشدا تۆ بە خۆرئاوابوون کاریگەر دەبیت وەکو وێنەیەکی جوان لەگەڵ ئەوەی هاوکێشەیەکی بیرکارییە لە درێژە شەپۆلەکان .. بە هەمان شێوە دەکرێت گوێدرێژیش لە واقیعدا ( ڕەگی دووجای ٣٤٣ س ) بێت لەگەڵ ئەوەی تۆ شتێکی جیاواز دەبینیت .. بوونەوەرێک سەر و دوو گوێی درێژ و کلکی هەیە، هەستەکانت بە زمانە تایبەتەکەیان ئەو هاوکێشە بیرکارییانە و

ئـەو ژمارانـەی دەیـان بینـن بـەم جـۆرە لێکدەدەنـەوە ..

وە ئامێـری ناردنـی تەلەفزیۆنـی کاتێـک وێنەکـەت دەنێریـت بـە هـەوادا بـە شـێوەی شـەپۆل دەینێرێـت و ئاریەلیـش وەری دەگرێـت و دەیگوازێتــەوە بـۆ ئامێـرە وەرگرەکـە لەسـەر شـێوەی ترپــەی کارەبایـی کـە بەهێـزی و لاوازییەکـەی دەگۆڕێـت .. بـڕی وزەن و لـە کۆتاییـدا هاوکێشـەیەکی بیرکارییانـەن بـۆ وێنـەی تـۆ .. وە ئـەو کارەی ئامێـرە وەرگرەکـە ئەنجامـی دەدات هـەر هەمـان ئـەو کارەیـە کـە هەسـتەکانمان ئەنجامـی دەدەن کاتێـک دیمەنـی خۆرئاوابـوون دەبینـن .. کاریـان ئەوەیـە ئـەم بـڕە ترپـە کارەباییانـە وەربگێـڕن و لێـک بدەنـەوە .. ئـەم هاوکێشـە بیرکارییانـە وەربگێـڕن بـۆ سـێبەر و ڕووناکـی لەسـەر شاشـەی وەرگرەکـە و وێنەکـەت دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەو دەرکەوتنـەی کـە پێشـتر دەتزانـی ( بـەڵام بـە تـەواوی شـێوەیەکی جیـاوازی لـە هـەوادا هەیـە .. ئـەوکات شـەپۆل بـوو .. هاوکێشـەیەکی پەتـی بـوو لـە سـنورە بیرکارییـەکان و بـڕ و چۆنیەتییـەکان ) ..

کەواتـە جیهـان دوو وێنـەی هەیـە ( لـە ڕاستیشـدا چەندیـن وێنـە بـە ئەنـدازەی جیـاوازی هۆکارەکانـی هەسـت )

ئەو وێنەیەی کە ئێمە دەیبینین ..

وە ئـەو وێنەیـەی کـە کیمیـای شـیکاری و سروشـتی و توێـکاری ئامـاژەی پێدەکات، کـە ئەویش ژمارە و بـڕ و چۆنیەتی و پەیوەندییە، کەرەسـتە و پێوەرەکانمـان نیشـانمان دەدەن ..

وە وێنەیەکی پەتی کە شێوازی بنەڕەتییە و زیاتر لە وێنەیەکی بۆشایی دەچێت یاخود نموونەیەک کە دروستکار سەرەتا دروستی کردووە ئەویش ڕوحە ..

هەموو دروستکراوێک ڕوحی هەیە .. ئەو نموونە و شێوە بنەڕەتییەیە کە دروستکراوەکەی لەسەر داڕێژراوە .. ئەویش نزیک کردنەوە و سادەکردنەوەیە و هەموو ئەو هەڵانەی تێدایە کە لە سادەکردنەوە و نزیک کردنەوەدا هەیە .. چونکە هەوڵدەدات شتێک بەرجەستە و تشخیص بکات کە ناتوانرێ بە قسە بەرجەستە بکرێت .. بۆیە کاتێک بیر و فیکر دەگاتە ناوچەی ڕوح هەردەم تووشی کەڕی و لاڵی دەبێت و ئەو زمانە نادۆزێتەوە کە دەتوانێت هەستی خۆی پێ ڕوون بکاتەوە ..

یەکییەتی شانەی بوونەوەران ڕاستەقینەیەکی ڕەهایە .. بەڵام ئەم یەکییەتییە ڕێگر نییە لە تاکی و ناوازەیی ئەم بوونەوەرانە .. جیاواز بوونی هەریەکەیان بە کەسایەتی و تایبەتمەندی خۆیان ڕەت ناکاتەوە ..

بەڵکو ئەم تاکی و تایبەتییە لە مرۆڤدا تایبەتییەکی ڕەهایە و نەک بەتەنها لە شێوازی ڕەفتاری و کەسایەتی و دەروونیدا بەڵکو تەنانەت لە پێکهاتنی بیناسازی ماددیشدا .. ئەوەتا دەبینین هەر مرۆڤێک پەنجە مۆرێکی تایبەتی هەیە و دوو کەس لە پەنجە مۆردا لەیەک ناچن تەنانەت ئەگەر دووانەش بن .. وە هەر لە دروستبوونی دروستکراوانەوە هەر تاکێک لە ملیۆنەها ملیۆن ئادەمیزاد پەنجە مۆری تایبەت بەخۆی هەیە ..

ئـەم تایبەتییـە ڕەهایـە لـە جەسـتە و دەروونـی هەمـوو مـرۆڤ و بوونەوەرێکـدا، حەقیقەتێکـی دیکەیـە زیـاد دەکرێتـە سـەر ئـەو یەککگرتووییـە ڕەهایـەی هەمووانـی لێـوە هاتـووە ..

بەڵکـو شـانەی زینـدوو تـا ئـەو ڕادەیـە تایبەتمەنـد دەبێـت کـە هەمـوو پینەیـەک لـە جەسـتەیەکی دیکـەوە ڕەت دەکاتـەوە .. بۆیـە جەسـتە هـەر دڵ و جگـەر و گورچیلەیەکـی جەسـتەیەکی دیکـە کـە بـۆ ڕزگارکردنـی دەهێنرێـت، ڕەت دەکاتـەوە .. دەمرێـت و پێـی باشـترە خـۆی بێـت وەک لـەوەی بـە پینـەی جەسـتەیەکی تـرەوە بـژی ..

تایبەتی و تاکی ئێمە حەقیقەتێکی ڕەهایە ..

هـەروەک چـۆن هاتنمـان لەیـەک بنەڕەتـی هاوبەشیشـەوە حەقیقەتێکـی تـرە ..

ئێمە لە یەکەوە دەردەچین ..

بـەڵام هەریەکەمـان یـەک دەگرێـت تـا ببێتـە ( تاکە شـانەیەک ) کـە نـە دووبـارە دەبێتـەوە و نـە هاوشـێوەی هەیـە ..

بەڵکـو چیرۆکـی ژیـان لـە کورتەیەکـدا بریتییـە لـە دەرچوونـی ئـەم کەسـایەتییە تاکـە جیـاوازە لـە کوێـری مـاددەی چوونیەکـی وەکـو ئـاو و گڵ ..

وە بۆمـان دەرکـەوت کـە تاکـە ڕاسـتەکە لـە پشـت ئـەم پۆلـە جیاوازانـەوە نابێـت تاکـی و تایبەتمەندیمـان لـێ قەدەغـە بـکات و

ڕەسەنایەتیشمان وەکو تاک لێ نەشارێتەوە ..

ئەویش تاکییەکی واتا دارە .. چونکە پاش ئەوەی هەریەکەمان لە تاکە ڕاستەکەوە هاتە دەرەوە لای خۆیەوە ئەویش هەوڵی دا ببێتە ( تاکێکی ڕاست ) لە خودی خۆیدا و ڕەسەنایەتی تایبەت و جیاوازی خۆی هەبێت ..

وە ئەم وێنە جەستەییە تاکەش گوزارشتی دەرەکییە لە تاکی ڕوحی ناوەکی و ڕەسەنایەتییەکەی ..

تاکی قاڵب گوزارشتی دەرەکی تاکی ناوەڕۆکە .. تاکی شێوە نیشانەی تاکی کرۆکە ..






## سەرە مێروولە

تەنانەت گوڵیش ئاوەزی تێدایە ..

گوێ بگرن .. ئەمە نوکتە نییە ..

گوڵ ئاوەزی تێدایە ..

وە گوڵە گەنم ئاوەزی تێدایە ..

دار بەڕووش ئاوەزی تێدایە .. هەرچەندە ئاوەزێکی بە ئەندازەی قەدەکەی ئەستوورە ..

جووڵەی ڕووەکی گوڵە بەڕۆژە کاتێک ملی بادەدات تا بە ئاڕاستەی خۆر بێت جیاوازییەکی وەهای نییە لەگەڵ جووڵەی مێشەنگین کاتێک بۆ کۆکردنەوەی هەنگوین لە شەقەی باڵ دەدات بەرەو کێڵگەکان .. وە جیاوازیش نییە لە جەنگی مرۆڤی بە ئاگا تا لە پێناو پەیامێکی بەرزدا، مەترسییەکان گەمارۆ بدات ..

لە نێوان ئەم سیانەدا پێکەوە بەستووییەکی زیندەیی هەیە ..

هەرسێکیان سیستمێکی ئەڵقەپەیوەستن و جیاوازی نێوانیان تەنها جیاوازییە لە پلەدا ..

جووڵەی گوڵە بەڕۆژە بەو سادەییەی خۆی .. ئاوەزە .. ئاوەز چییە .. ئاوەز توانای مامەڵەکردن و گونجاندنی ژینگەیە ..

لە چەند وشەیەکی سادەدا .. بریتییە لە توانای وەرگرتنی هەڵوێستێکی هەڵبژاردەیی گونجاوتر بۆ ژیان .. لە هەموو ساتێکدا ..

کاتێک گوڵێک گەڵاکانی بەرەو خۆر ئاڕاستە دەکات، هەڵوێستێکی هەڵبژاردەیی دیاریکردنی گونجاوتر بۆ ژیانی وەردەگرێت , ئەوا جووڵەیەکی ژیرانە دەکات ..

ئەمەش واتا ئاوەز شتێکی نوێ نییە لە مرۆڤدا .. ئاوەز لە هەموو سروشتی زیندوودا هەیە ..

هەموو جیاوازییەکە ئەوەیە کە مرۆڤ هۆکاری زیاتری لە بەردەستدایە تا مامەڵەیان پێوە بکات و بگات بە ئامانجەکانی ..

بەو پێیەی مرۆڤ دروستکراوێکی ئاڵۆزە و چەندین ئامێری هەیە کە هەر یەکەیان لە پلەیەکی بەرزی پسپۆڕی و تایبەتمەندیدایە .. بە نموونە دوو دەستی هەیە کە دە پەنجەیان تێدایە .. زمانێکی گۆیای هەیە .. دوو چاوی بینا و دوو گوێی تیژی هەیە .. وە پێستێکی هەستیار و .. لوتێکی بۆنکەریشی هەیە .. هەموو

ئـەم ئامێرانـەش لـە خزمەتـی ئاوەزیـدان ..

مـرۆڤ گیانلەبەرێکـی دەرەبەگـە خاوەنـی دەیـان هـەزار فەدانـە[1] لـە بەهـرە و چەندیـن باڵەخانـە لـە دەمـار و هەسـتی ناسـک ..

هەربۆیـە ئـەو سـتەمی لـە خـۆی و لـە بوونەوەرەکانـی دیکـەش کـرد کاتێـک پێـی وابـوو ئـەو تاکـە ژێـری ناویانـە .. ئەمـە خەیـاڵ پڵاوییەکـی دەرەبەگـی ناڕاسـتە ..

ئاوەز لە هەناوی هەموو سروشتی زیندوودا خۆی حەشارداوە ..

وە هـەر لـەو کاتـەوەی ژیـان لـە ئەمیبـای تاکـە خانـەی ئایەخـدا ترپـەی کـردووە .. جووڵـەی ئـەم ئەمیبایـە پڕبـووە لـەو وریایـی و دزە دز کـردن و پیسـی و بەدنیازییـەی لـە مرۆڤـدا هەیـە .. هیـچ شـتێکی نـوێ لـە مرۆڤـدا نییـە .. بەڵکـو تەنهـا تەواوکارییـە ..

***

ئەی نەفس ..

نەفس چییە ..

ئارەزووەکان چین ..

ئەمانـە ئـەو هانـدەرە سـەرەتاییانەن کـە هانـی گیانلەبەریـان دەدا بـۆ ژیـان .. بژێـوی ..

---

١) فـەدان : یەکـەی پارچـە زەوی کشـتوکاڵییە ڕووبەرەکـەی لـە شـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی تـر دەگـۆڕێ ....

ئـەو برسـییەتییەی هانـی دەدات بـۆ خـۆراک .. ئـەو تونییەتییـەی هانـی دەدات بـۆ خواردنـەوە ..

وە ئـەو سێکسـەی بـۆ پیتانـدن و زۆربـوون .. هانـی دەدات .. ئەمانـە هـەر هەمـان ئـەو هاندەرانـەن کـە هانـدەرە دەمارییـە جۆراوجۆرەکانـی مرۆڤیـان لـێ پەیـدا بـووە .. تەمـاح و تـرس و دێوانەیـی و توورەیـی و ڕق و خۆشەویسـتی .. هەمـان شـتن .. کۆمەڵێـک ئاگادارکـەرەوە و وریـا کـەرەوەی دەماریـن دەربـارەی پێداویسـتییە سـوور و پێویسـتەکانی جەسـتە ..

عەیبـی فرۆیدیـش ئەوەبـوو کـە لـە ئاسـت ئـەم ئاگادارکـەرەوە و ئـارەزوو و هاندەرانـەدا وەسـتا و بـە کلیلـی کەسـایەتی مـرۆڤ و کلیلـی نهێنـی و مەتەڵـی ژیانـی دانـان ..

ناکرێـت ژیـان ڕاڤـە بکرێـت بـە پەرچەکردارێکـی ئارەزووانـە بـۆ داواکردنـی خـۆراک و سـێکس و .. ناکرێـت ڕاڤەبکرێـت بـە ڕەفتارێکـی لۆژیکـی بـۆ گونجانـدن لەگـەڵ ژینگـەدا ..

ئەمانـە سـیفەتن لـە سروشـتی زینـدوودا .. بەڵام کلیلـی نهێنییەکەی نیـن .. ژیـان لـە پشـتەوە هانـدراو نییـە .. وە لێخوڕیـوی دەسـتی قامچـی ئـارەزووەکان نییـە .. بەڵکـو نەترسـە و چـاوی بڕیوەتـە بـەردەم خـۆی بـە سروشـتێکی ڕێنوێنـی بـەرز و بـە سـۆزێکی پـەرشـی نـاو خانـە و دەمـار و دڵـی .. ژیـان لـە ڕابـردووەوە پاڵنانرێـت .. بەڵکـو فڕێدراوەتـە داهاتـووەوە .. بـە سروشـتێکی ئاڕاسـتەداری نـاو ناخـی ..

ژیان بە پاڵنەرێکی دواوە زۆرلێکراو نییە .. بەڵکو پێگەشتوو و خاوەن هەڵبژاردە و بینایە و خۆی بە بەردەوامی بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت بە مەبەستی ئامانجەکانی سبەینێی ..

چەندین هاندەری ناوەکی تێدایە لە سەروو خۆیەوەن .. ژیان .. بەوپەڕی تەندروستی و تێرییەوە دەجوڵێت بۆ داواکردنی ئاستێکی سەرووتر لە ئاستی ژیانی ڕۆتینی و دووبارەی لێکچووی خۆی ..

خۆشەویستی جوانی و چاکە و ڕاستی لە کۆتاییدا یەکێکە لە وروژێنەر و هاندەرە ڕەسەنەکانی کرۆکی زیندوو .. وە جیاوازی نییە لە نێوان توانای شکسپیر بۆ دەردانی هۆنراوەکانی و .. توانای گوێچکە ماسی بۆ دەردانی مرواری و .. توانای خانەکانی پەپولە بۆ کێشانی ئەو زەخرەفە ناوازە و جوانانە لەسەر ڕووی باڵەکانی ..

پەپولە پێویستییەکی زیندەیی بۆ کێشانی ئەم زەخرەفانە نەبوو .. باڵەکانی دەیانتوانی بەبێ ئەوەی نەخشدار بن بە تەواوی و لێهاتووانەوە بەکاری خۆیان هەڵبستن .. کەواتە نهێنی نەخشداری چییە ..

گەر بڵێین هۆکارەکەی چەند وروژێنەرێکی سێکسییە و مێینەکان بۆ نێرەکان خۆیان جوان دەکەن .. ئەوا پرسیارەکە بە ئاڕاستەکراوی دەمێنێتەوە .. ئەی بۆچی نێرەکان مێیە جوانەکان هەڵدەبژێرن .. جوانی هەردەم خۆی وەکو ئامانجێک دەسەپێنێت

نهێنییەکەش هەمان ئەو نهێنییەیە کە وای لە شکسپیر کرد هۆنراوە بچڕێت .. هۆنراوە خۆراکی ژیان نییە .. بەڵکو ورووژێنەری جوانی و .. هاندەری داهێنانن لە سروشتی شکسپیردا .. وە لە سروشتی پەپولە و .. هەموو سروشتی زیندوودا ..

لە وردە زیندەوەری یەکەم خانەدا تۆوی هەموو ئەم ڕازە جوانییانە هەیە .. ئەو خانەیەی ژیانی بە خواستن و گەڕان بەدوای پلەیەکی دیاریکراوی گەرمی و کەش و خۆراکێکی گونجاو بۆ گەشە و زۆربوونی دەست پێکرد .. لە ناخیدا ئامانجی دوورتری حەشاردابوو و پاش ئەوەی جڵەوی ژیانی خۆی لە ئاوەزی مرۆڤدا دەستخست ئەوەنەی نەبرد گوزارشتی لەم ئامانجە دوورانە کرد و دەستی کرد بە چڕینی جوانی و ڕاستی و چاکە و دادپەروەری و ئاشتی ..

پێشەنگی باڵا لەژێر پێستتدایە ..

وە بەها باڵاکانیش لە شانەی پرۆتۆپلازمدا[٢] ..

وە ڕاڤە کردنی مرۆڤ وەکو تەنها لاشەیەک .. یاخود تەنها نەفسێک .. یاخود ئاوەزێک .. خاڵی لە ورووژێنەرە ڕوحی و ویژدانییەکان .. ڕاڤەیەکی ناتەواوە و مرۆڤ نزم دەکاتەوە بۆ ئاستی ژمێرەرێکی لۆژیکی و ئامێرێکی ژمێریاری بیرکاری و.. تام و چێژ و گەرمی بوونی مرۆڤایەتی زەوت دەکات ..

---

٢)پرۆتۆپلازم : پێکهێنەرە زیندەییەکانی ناو خانەیە ..

ڕووەکی گوڵە بەڕۆژە .. تەنانەت ڕووەکی گوڵە بەڕۆژەش چاو دەبڕێتە خۆر ..

ڕووەکی سوبێر .. ئەویش چەندین پۆلی جیاواز دەردەهێنێت هەروەک بڵێیت بە دەستی پەیکەر تاشێکی هونەرمەند داتاشراوە ..

مێشەنگوین .. بە هەمان شێوە مێشەنگوینیش ماڵەکەی بە بنیاتێکی ناوازەی ئەندازەیی بنیات دەنێت .. سروشتی زیندوو سروشتێکی برسی و سێکسی نییە بەڵکو سروشتێکی هونەرمەندی ژیر و بینا و خەون بینە ..

وە پێشەنگی باڵا و ئامانج و خەون و ئاواتە بەرزەکان شتانێکی تایبەتمەند بە مرۆڤ نین .. بەڵکو لە کرۆکی هەموو زیندوویەکدان ..

ئەوە تەنها خۆ بەزل زانی ئێمەیە بەهۆی دەستخستنمان بۆ فراوانترین سامانی ئامێر و هەستەکان .. ئەم خەیاڵ پڵاوییەی بۆ وێنا کردووین ..

وە لە ئەنجامی لێشاوی ئەم سامانانەوە لەسەرمان .. ئێمەش بە لێشاو و تواناکانمان دا بەسەر ژینگەی دەوروبەردا ..

وە دەستمان کرد بە پەخشکردنی سیستەم و یاساکانی خۆمان و چەندین سیستەم و شێوازی نوێمان دروست کرد .. خانوو و تاوەر و شار و کارگەکان دروست دەکەین و .. چەندین باڵەخانە لە شیعر ئاوەز و ڕەنگەکان دادەهێنین و .. شەریعەت و یاسا

و دەستوور دادەمەزرێنین .. لە خۆشی ئەم زریانی سامان و دەوڵەمەندییە .. لەبیرمان کردووە کە هەموو ئەم بەخششانە بەجێماوی باوانمانە لە گیانلەبەران .. وە پێش ئەوەی بگەن بە ئێمە لە سەری مێروولەدا بوون .. لە نیانی درەختدا .. لە ناواخنی ئیسفەنجدا .. وە لە شەربەتە تاڵەکەی سوبێردا ..

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پەرجووی[٣] ژیان بەتەنها لەیەک بوونەوەردا نییە .. بەڵکو لەخودی شانەی زیندوودایە .. ئیدی ئەم شانەیە لەهەر کوێیەک بێت و رووەک بێت یاخود ئاژەڵ بێت یاخود مرۆڤ .. یاخود خانەیەک بێت لە گۆماوێکدا بە هێواشی و کوێرانە پێ بە زەویدا بنێ ..؟

بۆ ئەوەی ببینێت و ببیستێت ..

یاخود لە پرۆتۆپلازمدا .. ئەو ماددە جەلاتینییە مەڵهەمییەی هەر دەڵێیت محەلەبییە و کونجی و فستقی بەسەردا کراوە ..

ئەو کەسانەی لەژێر وردبیندا پرۆتۆپلازمییان بینیوە دەزانن کە دەجوڵێت و دەنکە کونجی و فستقەکان لەناویدا بەدەوری بوندوقێکی رەقی ناوەڕاستیدا دەخولێنەوە کە ئەویش ناوکە .. وە هەندێک جار دیوارێکی هەیە دەیپارێزێت .. هەندێک جاریش دیواری نییە .. بەڵکو وەکو برێکی مەڵهەمی لووس و تۆپەڵ هاوشێوەی دڵۆپە ڕۆنێک لەناو ئاودا خۆی با دەدات ..

٣)پەرجوو : موعجیزە .



## س

من (س ٣) م و تۆش لۆگاریتمی (س ١٩) ..

لـەم قۆناغـی بیرکردنـەوە و تێڕامانـەدا بۆمـان دەرکـەوت .. مـرۆڤ بوونەوەرێکـی ئاوێتەیـە .. وە شـتێکی سـادە و دیاریکـراوی وەکـو کورسـی و مێـز و مەرەکەبـدان نییـە .. بەڵکـو ڕاسـتییەکی گەشەسـەندووی پێشـکەوتووە لـە هەمـوو سـاتێکدا بڕیـار دەدات .. بـە ویسـتێکی تایبـەت .. وە دەتوانێـت لـە چەندیـن ئاسـتدا بـژی ..

دەتوانێت ژیانێکـی چڕ و توندوتیـژ و پـوکاوەی وەکـو ڕووەکـەکان بـژی .. هـەروەک لەکاتـی نوسـتندا ڕوودەدات .. بچـووک دەبێتـەوە لەچەنـد فرمانێکـدا کـە بـە شـێوەیەکی ئۆتۆماتیکـی و لەخـۆوە بـێ ئاگایـی ڕوودەدات ..

هـەروەک دەتوانێـت ژیانێـک لە چەلەحانێ و ڕاهاتوویی و دووبارەیی بـژی .. چەنـد بیرکردنەوەیەکـی ئامادەکـراو و چەنـد خووێکـی بۆماوەیـی بەڕێـوەی بـەرن و چەنـد کلتورێکـی کـۆن بیجوڵێنـن .. وە

کارەکانی لەچەند وادەیەکی دیاریکراودا ئەنجام بدات کە خەڵکی بە خولەک و کاتژمێر بۆی دیاری دەکەن ..

وە دەشتوانێت لە ژیانێکی قوڵدا بژی .. تیایدا بگەڕێتەوە بۆ خۆی و پابەندی بیرکردنەوە و ئارەزووەکانی خۆی بێت و لەکاتی تایبەت بەخۆی و بەرھەمی ویست و سۆزی خۆیدا بژی .. لەم ئاستەدا ژیان ڕەسەن دەبێت و .. ڕەفتارەکانی ڕەنگدانەوەی ڕاستەوخۆی کەسایەتی خۆین ..

ھەروەھا دەتوانێت بگاتە قوڵایی قوڵاییەکانی بوونی لە ساتی خۆشەویستیدا .. وە لە ساتی تێڕامان و ساتی داھێناندا .. ساتی تەسەوف .. ھەستەکانی بە ڕووی ھەستێکی بەردەوام و ھەتا ھەتاییدا دەکرێنەوە .. وە تامی ساتێکی سەیری ناکاتی دەکات .. ناکەسایەتی .. ساتێکی قوڵ .. ھەموو ساتەکان دەتوێنەوە و ھەموو ڕۆژەکان تەواو دەبن و ھەموو ساڵەکانیش تێدەپەڕن .. بەڵام ئەو ساتە بە زەقی لە بیرەوەریدا و بە ھەڵواسراوی لە ویژدانیدا دەمێنێتەوە ..

ئەم ھەستە ئاماژەیە بەوەی کە مرۆڤ لە ناخیدا بەسەر بوونێکی دیکەدا کراوەتەوە .. بوونێکی جیاواز لە بوونە دەرەکییە بێگیان و سنوردار و ئۆتۆماتیکییەکەی کە لە نێوان حەتمی بوون و یاساکاندا دێت و دەچێت .. بوونێکی ئازاد کە نە لە کات و نە لە شوێن وروژم دەکات و نە ھۆکاریشی ھەیە .. بوونێک ڕاگرەکانی لە خۆیدایە و .. ھۆکارەکانیشی ھەر لە خۆیدا .. بوونێک سەرچاوەی ویست و کەسایەتی و ڕەفتار و کردارە

.. وە وا دەردەکەوێت کە جیهانی واقیعی بەشێک بێت لێی و دەرئەنجامێک بێت لە دەرئەنجامەکانی ..

بوونێکی قوڵی هاوشێوەی سەرچاوەی کانی شاراوە، ڕەگ و دەمارەکانی مرۆڤی تیا چەقیوە و بوون و هەست کردن بە حەقیقەتی پێ ئاو دەدات .. هەست کردنی بە بەردەوامی لە گێژەڵووکەی هەل و مەرجی گۆڕاو و قڵپ بووەوەدا .. وە هەست کردنی بە زەوییەکی جێگیر لە ناوەڕاستی ئەم دیاردە هەڵوەشاوانەی بریسکە دەدات و ون دەبێت .. هەروەها متمانەی ئەوەی لێوە وەردەگیرێت کە ئەمن و ئاسایشێک هەیە .. ئارامی و دڵنیاییەک ..

بوونێکی هەتا هەتایی کە تیایدا ژیانی کاتی ڕاستەقینە دەردەکەوێت تەنها لەبەرئەوەی لەوەوە سەرچاوەی گرتووە و سەر بەوە ..

نەفسیش هەردەم پەنا دەباتە بەر ئەم بوونە ناوەکییە .. دەبێتە پەنابەری .. بەهۆی ئەو دڵەڕاوکێ و تێکچوونی مێشکەی کە واقیعی ماددی بە گۆڕانکاری و قڵپبوونەوەکانی دروستی دەکات ..

هەر ئەمەشە بوونی (من) ی ڕەها .. یاخود هەتا هەتایی .. یاخود حەقیقەت و یاخود ڕوح ..

مەبەستیشم لە ڕوح مانا کەسایەتییەکەی نییە .. چونکە ئەم بوونە کەس نییە .. وە زۆر لەوە قوڵترە کەس بێت و .. زۆر

لەوە قوڵتـرە دیاریکراو بێت .. هەل و مەرجی دەستنیشانکراو و دابەشکراو بۆ چەند جوڵە و گۆڕانکارییەک لە کات و شوێندا .. هەل و مەرجی کات و شوێن .. هەل و مەرج تەنها دیاردەکانە .. وەلێ بوونی ناوەکی بوونێکی جەوهەرییە و قابیلی دابەشکردن و فرە کردن نییە .. حەقیقەتی هەموو ئەم دیاردانە و سەرچاوەکەشیانە .. ئەو بوونە سەرچاوەی کەسایەتییە بەڵام هەرگیز خودی کەسایەتی نییە ..

وە حەقیقەتیش سادە و یەکە و هەموو ئەو فرەیی و دژایەتی و جیاوازییەی دەیبینین نا ڕاستین و ڕووکەشی و کاتین .. بە بەڵگەی ئەوەی هەموویان پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە و .. سەر بەیەکن .. وە لە ژێر فرەییە دیارەکەیانەوە یەکییەکی ڕەسەن هەڵدەقوڵێت ..

هەروەها لەماوەی ئەم قۆناغە فیکرییەدا بۆمان دەرکەوت کە هەموو دروستکراوان تەنها پۆل و کۆمەڵەی جیاوازن لەیەک ماددە ئەویش پرۆتۆپلازم و یەکەی وردی برگەیی واتە خانەن .. هەموو پۆل و کۆمەڵەن لە (س) .. ئەم (س) ەش زیاتر لە ماددەکەی مارکس و هیولاکەی ئەرستۆ دەچێت .. ئەو خامە یەکەمییەیە کە دونیای لێ بنیات نراوە ..

تەنانەت پۆلەکانی ماددەی مردووش کۆمەڵەی جیاوازن لە یەکەی سادەی وەکو ئەلکترۆن و پرۆتۆنەکان کە بارگەی پۆزەتیف و نێگەتیفی وزەن .. ئەم وزەیە جارێک لە شێوەی گەرمیدا دەبێت و .. جارێک لە شێوەی کارەبا و .. جارێک لە

شێوەی ڕووناکی و .. جارێک لە شێوەی بواری موگناتیسی و .. جارێک لە شێوەی جووڵە و جارێکیش لە شێوەی ژیاندا ..

توخمە جیاوازەکانی گرافیت و سۆدیۆم و ئاسن و مس و گۆگردیش تەنها کۆمەڵەی جۆراوجۆرن لەم ئەلکترۆن و پرۆتۆنانە و .. دەکرێت توخمێک بگۆڕین بە توخمێکی دیکە بە گۆڕینی پێکهاتە و کۆمەڵە گەردیلەییەکەی ..

هەموو جیاوازییەکانی نێوان بوونەوەرەکان جیاوازی ڕووکەشی و شێوەیین و قابیلی لێکردنەوەن بۆ یەک بنەڕەتی هاوبەش ..

لە هەناوی ئەم گەردوونەدا یەک حەقیقەتی سادە هەیە .. یەک کرۆک .. ڕەگێک هەموو لقەکانی ئەم درەختەی لێوە ڕوواوە .. هەر لقێکیش بەو ئەندازەیەی گوزارشت لە بنەڕەتەکەی بکات، ڕاستەقینەیە .. وە بەو ئەندازەیەی لە خانە و گوڵەکانیدا مۆرکی بۆماوەیی هەڵگرتبێت، ئەوەندە ڕاستەقینەیە ..

تەنانەت هەسارە و ئەستێرە و نەیزەکەکانیش تەنها کۆمەڵەی جیاوازن لە ماددە کە لە هەوای گەردیلەیی و تۆزەوە پەیدابوون .. ئەو هەورانەی لە بۆشاییدا مەلەیان دەکرد ..

(بوون) بەرهەمانێکی بێ کۆتان .. چەند وێنەیەکی بێ کۆتان کە خاوەنی یەک بنەڕەتن و یەک حەقیقەتی سادەی ئەزەلین کە ناوەڕۆکەکەی دەوڵەمەند و بێ کۆتایە ..

لە چەند قاڵبێکی بێشوماردا دروست دەبن و .. فرەیی بوونەوەر و دروست کراوەکان بەڵگەی ئەم سامانداری و دەوڵەمەندییەن ..

فرەییش لە واقیع و لە ڕووکەش و جیهانی بەرچاودا فرەییە .. بەڵام خامە ڕەسەنەکە هەر یەکە .. سادەیە .. بەڵکو ئەوە کەسەکانن فرەیی دەکەن .. هەرکەسێک خودی خۆی جۆرێکی دانسقەیە لەم تاکە خامە .. بەڵام لە کۆتاییدا لەناو دەچێت ..

هەموو دیاریکراوێک لەناو دەچێت و ..

هەموو بوونێک لە کات و شوێندا لەناو دەچێت ..

هەموو شێوە و ڕێکخراوێک دەڕوخێت هەروەک چۆن باڵەخانەیەکی بنیاتنراو لە خشت و گەچ و چیمەنتۆ دەڕوخێت .. بەڵام پرۆژەکە دەمێنێت .. وێنە ئەندازەیی و دیزاینە بنەڕەتییەکەی کە باڵەخانەکەی لەسەر بنیاتنراوە هەر دەمێنێت .. ئەم بنەڕەتە لای ئەرستۆ ( وێنە ) یە و .. لای ئێمە ( ڕوح ) و .. لە فەلسەفەشدا ( من ) ی ڕەهایە ..

ئەم وێنە ئەندازەیی و دیزاینە بنەڕەتییەش داهێنراوی دروستکارە و لە ڕوح و لە فووی ئەوە هەربۆیە نامرێت ..

وە ئەم ڕوحە .. ئەم منە ڕەهایە .. کە نە کەسێکە و .. نە نەفسێکە بە دیاریکراوی .. ئەوە کە بە گوێماندا سەرسامانە دەچرپێنێت کاتێک مردن دەبینێت و .. باوەڕی پێناکات و .. گرنگیشی پێ نادات .. چونکە بەلای ئەوەوە بابەتێک نییە ..

وە کاتێک ئێمە دەتۆقین لە مەرگ .. لە ڕاستیدا لە ترسی منی ڕەهادایین ..

ترسی ئەو هەستە ئازیز و گەرم و گورەی دەمانبەستێتەوە بە خۆمان و بە واقیعەوە .. پێویست بە تۆقینیش ناکات .. چونکە ئەو ڕەهایە لە ناوچەیەکی هەتا هەتاییدایە کە مەرگی تێدا نییە .. نە گۆڕان و .. نە ئاڵوگۆڕیش .. ئەوەی لە ئێمەدا دەمرێت .. ئەوەیە کە هەموو ڕۆژێک دەمرێت .. وە هەموو ڕۆژێک دەگۆڕێت .. جەستەمان .. نەفسمان .. کەسایەتیمان .. هەموو ئەمانە دەمرن ..

چونکە بە کرداری دەمرن .. دەمرێت بە ژیان .. دەگۆڕێت و .. ئاڵوگۆڕ دەبێت .. وەلێ ڕوح .. منی ڕەها .. بۆ هەمیشە زیندووە ..

ئێمە لە ناوەوە بەسەر ئەم یەکە ڕەهایەدا کراوینەتەوە .. ئەم یەکە ناکەسییە .. نا کاتی و نا شوێنییە ..

وە سەبارەت بەم منە ڕەهایەش .. واتایەکی بۆ مەرگ و لەناوچوون و گۆڕان و ئاڵوگۆڕ نییە ..

ئەو فرەیەکی ناکۆتا و .. سامانێکی ڕەهایە .. سەرچاوەی کردەوە و کەسایەتی و ژیانی ئێمەیە .. پاشان ئێمە دەمرین و تێری لێ دەخۆین .. بەڵام ئەو لەو جیهانی ڕوحەدا کە لێوەی نێردرابوو دەمێنێتەوە ..

وە لەبەرئەوەی ئێمەش لە ناخماندا بەسەر ئەم ڕەهایەدا کراوەین .. وا خەیاڵ دەکەین کە ئێمەش نامرین ..

ئەمــە ئــەو تێکەڵاوییــە ڕاســتەقینەیەیە کــە بەهــۆی ژیانــە چەندییەکەمانــەوە دەکەوینــە نــاوی .. بەهــۆی سروشــتە تێکەڵاوەکەمانـەوە لـە ڕوح و جەسـتە .. ئێمـە وەکـو ترپـە دڵێکـی هەڵچـوو وا خەیـاڵ دەکەیـن کە قەوارەیەکـی سـەربەخۆمان لـە دڵـە بەردەوامەکەمــان هەیــە ..

بەهـۆی ئـەوەی ئێمـە بەرهەمی ڕوحی نەمریـن و لایەنگرین دەکەوینە ئـەم وەهمـەوە .. بـەڵام ئێمـە لەنـاو دەچیـن .. تەنانـەت ئەوکاتـەش کە لـە ژیاندایـن لـە دۆخێکـی لەنـاو چوونـی بەردەوامدایـن .. وە ئـەو دەزووی بوونــەی ســاتەکانمان پێکــەوە پەیوەســت دەکات و جووڵــە هەڵوەشـاوەکانمان لـە شـوێندا دەگرێـت .. ئـەو یەکـە یەکگرتـووەی بەناوماندا دەڕوات و دەسـت بـە بوونـی نـا یەکگرتوومانـەوە دەگرێت نـە لـە جیهانـی کات و نـە لـە جیهانـی شوێنیشـە .. وە نە لـە جیهانی کەسـی و دیاریکـراوی .. وە لـە ئێمـەش نییـە بـەو ئەندازەیـەی کـە ئێمـە لەویـن .. وە خـودی خـۆی یەکەیەکـی تایبـەت و دیاریکـراو نییـە .. بەڵکـو سـیاقێکی ڕەهـا و نـا دیاریکـراو .. سـیاقێک هەمـوو ئـەو هەڵوێسـتانە دەگرێتـەوە کـە ئێمـە لـە ژیانمانـدا وەری دەگریـن و هەروەهـا شـتێک هاوشـێوەی منـی ڕەهـا لەخـۆ دەگرێـت کـە ئەویـش ڕوحمانـە و پریشـکێکە لـە ڕوحـی خودایـی مـەزن کـە سـەرچاوەی هەمـوو بوونـە و هەمـووش هـەر بـۆلای ئـەو دەگەڕێتـەوە ..

هەربۆیــە دەبینیــن هەمــوو شــێوەکانی بــوون بــە پەیوەنــدی خزمایەتــی پێکــەوە بەســتراون ..

وە سیلەی ڕەحمێک هەموویان لە خامێکی بنەماییدا کۆدەکاتەوە .. ئەو ئاڵوگۆڕەی هەموو ساتێک لەنێوان پۆلەکانی بوونەوەراندا ڕوودەدات ئەم پەیوەندییە خێزانییە زیاتر ئاشکرا دەکات .. ڕووەک خوێیەکانی فۆسفات و نیترات لە زەوی وەردەگرێت و لە هەواشەوە ئاوێتەکانی کاربۆن و هەڵمی ئاو .. پاشان ئەم ماددە کانزاییە مردووانە دەگۆڕێت بۆ شانەی زیندوو و سەوزی وەکو شانەکانی خۆی .. ئاژەڵیش شانەکانی ڕووەک دەخوات و دەیگۆڕێت بۆ گۆشت و خوێن و ماسولکە و پاشان ئەم ئاژەڵە دەمرێت و بۆگەن دەکات و دەگۆڕێت بۆ گڵ و خوێی کانزایی بۆ دایکە زەوی ..

ئەم ئەڵقە گۆییە ئەو خامە هاوبەشەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە هەموو ئەم شێوە جۆراوجۆرانەی لێ دروست بووە ..

وە سەرەڕای ئەو جیاوازییە گەورەیەی لە پلەی ئاژەڵیدا هەیە لەنێوان پڵنگی دڕندە و لەنێوان مرۆڤی ناسکی نەرم و ژیر ..

بەڵام ئەو نیگایەی ئەم دووانە لە بارنەی سێرکدا دەیگۆڕنەوە .. نیگای ئاژەڵڕاهێن بۆ ئاژەڵ کاتێک لەبەردەم قاچەکانیدا کڕنووشی بردووە، ئەو شتە هاوبەشەی ئەم دووانەی پێکەوە بەستووە بە پەیوەستییەکی شاراوەی سۆز و خۆشەویستی، ئاشکرا دەکات ..

سەرەڕای هەموو ئەو وەحشگەراییەی لە پڵنگدا هەیە و .. هەموو ئەو نەرم و نیانەی مرۆڤ هەیەتی .. کەچی پڵنگ لە ساتێکی سۆزدارانە و نەرم و نیانیدا بە مرۆڤ دەگات .. وەک بڵێیت لە ئەزەلەوە یەک دەناسن .. بەو پێیەی دروستکارییان یەکە و ماددەی دروستکردنەکەش هەر یەک شت .. بەم شێوەیە

لە پشت هەموو چاوەکانەوە جەلال و گەورەیی دروستکار نزیکتر لە شادەماری ملمان بەسەرماندا هەڵدێت ..

* * *

تاکە ڕاستەکە لەپشت فرەییەوە شاردراوەتەوە .. وە لە یەکچوونی ڕەسەن لەپشت جیاوازییەکانەوە ,وابەستەیی سۆزدارانەش لەپشت هەڵوەشاوەیی بەرچاوەوە ..

هەموو بوونیش سرودێکی درێژە لە ملیۆنەها وشە گوزارشت لە ڕوحێکی خودایی نەمر دەکات .. و لە مانا بێ کۆتا و .. سەروەتە پڕ لە تواناکانی ..

مانای مەرگیش ئەوەیە دروستکار پێمان دەڵێت :

لەمەش زیاترم لایە .. توانای دیکەشم هەیە کە تەواو نابێت .. تەماشاکەن .. هانێ ئەوە شتی تەواو جیاواز .. هانێ سوپرایزێکی دیکە .. هانێ لەدایک بوونی منداڵێکی نوێ ..





## گڵ

دەنکە گڵەکان شتانێکی هیچ و ئایەخ نین ..

جووڵە و ترپەی دڵیان تێدایە ..

ئایا بە کرداری ماددە شتێکی بێگیانە ؟!!

ئایـا تەنهـا بارسـتەیەکە لـە بێدەنگـی و سسـتی و مـەرگ .. بـێ چالاکـی و بـێ کارایـی ..

نەخێر ..

ئەمە درۆیە ..

خودی وشەی بێگیانیش گەورەترین درۆیە ..

بێگیـان لـە حەقیقەتـی خۆیـدا نـە بەسـتوو و ڕەق و نـە شلیشـە .. بەڵکـو لـە ناوەوەیـدا دابـەش بـووە و لەچەنـد سیسـتەمێکی گـەورەی گـەرد و گەردیلـە پێـک دێـت کـە لـە بۆشـاییەکی بەرگـە هـەوادا مەلـە

دەکەن ..

گەرد بونیاتنراوێکە لە گەردیلەکان ..

گەردیلەکانیش بونیادێکی جوانن لە تەنی بچکۆلەی ناوەکی , کە چەند بارگەیەکی کارەبایی ئێجگار بچووکی ڕێکخراو لە خولگەکاندا، بەدەوریدا دەخولێنەوە .. هەروەها گەرد و گەردیلەکان بە چەند یاسایەکی کێش کردن و دوورکەوتنەوە بەیەکەوە بەستراون بەبێ ئەوەی بەیەکدا بکێشن و لەیەکدا بتوێنەوە و شێوە و کەسایەتییان لەدەست بدەن ..

هاوشێوەی خۆر و کۆمەڵە گەورەکەیەتی لە مانگ و هەسارەکان .. بە کێشکردن پێکەوە بەندن .. بەڵام نەک تاکو ئەو ئاستەی کە بە یەکدا بلکێن و لەیەکدا لەناو بچن .. بەڵکو کێشکردنێکە لە بەرامبەریدا دوورکەوتنەوە هەیە کە دەبێتە هۆی پاراستنی ئەم مەجەڕڕە ئاسمانیانە بە شێوە و کەسایەتییەکانیانەوە ..

خۆر بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە .. هەروەک چۆن بارگەکانی گەردیلە دەخولێنەوە .. هەروەک چۆن هەموو شتێک لە جیهاندا دەخولێتەوە .. بە زیندوو و مردووەوە .. بە شل و گاز و بەستووەوە ..

وە هیچ جیاوازییەک لە نێوان ڕەق و شل و گازدا نییە جگە لە خێرایی خولانەوە .. گەردیلەکانی شل خێراترن و .. گەردیلەکانی گاز زۆر خێراتر .. بۆیە زۆر هەڵدەوەشێت و دەبێتە تۆزێکی بە با دراو .. یاخود بە دەربڕینە ساویلکانەکە .. دەبێتە هەوا ..

دەرکەوتنی گڵ بەو شێوەیەی کە شتێکی هەڕەمەکی و پەرتەوازە و ناڕێک و پێکی بێ شێوە و بێ سیستەمە .. دەرکەوتنێکی ناڕاستە .. بەڵکو وردترین وردەکارییەکانی گڵ سیستەمی تێدایە .. شێوەی هەیە .. ڕێکخستن و جیاکردنەوەی هەیە .. وە جووڵەیەکی گوازراوەی لە گەردیلەکانیدا هەیە ..

هەموو شتێک لە گەردووندا وێنە و سیستەم و جیاکاری و وردەکاری و شتێک هاوشێوەی لێدان و ترپەی دڵی هەیە .. لێرەشەوە ئیدی هێڵی جیاکەرەوەی نێوان زیندوو و مردوو باریک دەردەکەوێت .. وە هەرچەندە بە قوڵی تەماشای سروشتی مادده بکەین، هێڵەکە تەنک تر دەبێتەوە ..

چونکە مادده بە تەنها لە دۆخێکی جووڵەدا نییە .. بەڵکو جووڵەکە ئامانجداریشە .. گەردیلە ناتێرەکانی کاربۆن ئامانجدارانە بەرەو تێربوون و هاوسەنگی دەجووڵێن .. وە پەیوەندی و ئاوێتە و کارلێک لەگەڵ ماددەکانی تردا بۆ ئەم مەبەستە دروست دەکەن ..

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت پێکهاتەی ئەم ماددەیە سیستەم و جووڵە و ئامانجی تێدایە .. نەک هەر ئەوەندەش بەڵکو پێکهاتنی ماددەکان هەندێک جار مۆرکی کەسایەتی و تاکی پێوەیە و .. پێوەی پابەند دەبێت و پارێزگاری لێدەکات .. بۆ نموونە (گۆگرداتی مس ) خۆی لە چەند بلورێکی دیاریکراودا ڕێک دەخات و هەموو جارێک بەهەمان شێوە لە گیراوەکاندا خۆی نوێ دەکاتەوە .. وە لەناو گیراوەکاندا گەشە دەکات و ئەگەر بلورێکی

ببرڕێت و ببێت بە دوو بەشەوە ئەوا هەر بەشێکیان گەشە بەجیا دەکات و پارێزگاری لە مۆرکی خۆی دەکات ..

وە زۆربەی ماددە ئەندامی و نا ئەندامییەکان بلوری تایبەتیان هەیە پێی دەناسرێنەوە هەروەک چۆن کەسەکان بە پەنجە مۆرەکانیان دەناسرێنەوە .. ئاسن بلوری خۆی هەیە و .. نیکڵ بلوری خۆی و .. سلیکا بلوری خۆی و .. بەردەکان _ بەهەموو جۆرەکانیەوە _ بلوری خۆیان هەیە ..

ئەو کەسەش کە لەژێر وردبینندا ئەم بلور و کریستاڵانەی بینیوە گەواهی ئەوە دەدات کە جوانییەکی ئەندازیارییان تێدایە و بۆ ماوەیەکی زۆر وەستاندونی ..

مانای ئەمەش ئەوەیە کە ماددەی بێگیانی مردوو .. جووڵەی تێدایە .. ئامانجداری بەرەو هاوسەنگی و .. سیستەم و .. جوانی و .. تاکی و .. بلوراندنی تێدایە ..

ئەم سیفەتانەش بەربەستە دانراوەکەی نێوان ژیان و مردن دەشکێنن .. وە دەسەڵاتەکانی ژیان لە ماددەی بێگیانی مردوودا دەردەکەن .. ماددەیەکی بەتاڵ و بۆش نییە .. بەڵکو سیستمێکە وێنەی هەیە ..

وە جیاوازی نێوان ژیان و مەرگ دەبێتە جیاوازی لە پلەدا .. جیاوازی لە پلەی ئاڵۆزی و .. پلەی پێکهاتە و .. پلەی ڕێکخراوی لە وێنەیەکی تاکدا .. سیستەمی ژیان سیستەمێکە لەوپەڕی ئاڵۆزی پێکهاتە و ئەوپەڕی پسپۆڕیدایە ..

بەڵام تواناكانی ئەم ژیانە بەرز و پسپۆڕ و تایبەتە لە ناوەخنی ماددەدایە .. ئەمەش مانای ئەوە نییە زیندوو مردووە و .. مردوو زیندووە .. بەڵكو مانای ئەوەیە پەیوەندی نێوان ماددەی زیندوو و مردوو نەپچڕاوە ..

واتا جیهان لە یەكگرتوویەكی بەناو یەكچوودایە و لەیەك بنەڕەتەوە هەڵدەقوڵێت و یەك سروشتی هەیە .. واتا ڕوح بە هەموو جیهاندا بڵاوبۆتەوە وە ئاوەز لە هەناوی هەموو چەند هێندەكانیدایە .. بە جۆرێك هەموویانی لە چەندین ئاوێتە و جۆر و قاڵب و نەخشدا وێنا كردووە .. كە سیستم و یاسا و جوانی تێدایە .. وە جیاوازییەكانی نێوان ئەم قاڵب و نەخش و شێوازە مردوو و زیندووانە بگاتە هەر چەندێك .. قوڵبوونەوە لە تێگەشتنیان دەیانگەڕێنێتەوە بۆ بنەڕەتە تاكەكەیان و ئەو ڕەگە هاوبەشەی لێوەی هەڵقوڵاون .. لێكچوونی هەموویان و .. یەكگرتووییە كرۆكییەكەیان دەردەخات .. گەردوون پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ یەكدا هەیە ..

ئێمە و خۆر و مانگ و مار و میكرۆب هەموو كوڕە مامی یەكین

وە كاتێك داروین بنەڕەت و ڕەسەنایەتی جۆرەكانی لە بیردۆزی پەرەسەندنەكەیدا دۆزییەوە .. خەڵكی گاڵتەیان پێدەكرد .. چۆن مرۆڤ و مەیموون كوڕە مامی یەكن ..

بەڵام داروین بە توێژینەوەی توێكاری سەلماندی كە بابەتەكە نوكتە نییە و پێكهاتەی توێكاری و سلوكی فەرمانی ئاژەڵ و ڕووەك

و هەموو زیندەوەرەکان دەیانخاتە یەک ڕێچکەی خێزانییەوە ..

داروین خەونیشی بەوەوە نەدەبینی کە دوای مردن و تێر مردنی بەڵگەی مەترسیدارتر ببینێت دەربارەی بنەڕەتی جۆرەکان ..

بەڵام هەر ئەوە ڕوویدا .. چونکە لەبواری کیمیاییدا سەلمێنراوە کە هەموو زیندەوەران یەک شانەی پێکهاتەییان هەیە ..

هەموویان سیستمێکی کاربۆنین ..

هەروەها ئەوەش سەلمێنراوە کە لێکچوونێکی وردتریان هەیە و .. هەموویان لە گەردی خاوەن ڕێکخستنی چەپەوانە پێکهاتوون

پاشان توێژینەوە وردەکارەکانی گەردیلە لێکچوونی قوڵتریان لە هەموو گەردووندا دۆزییەوە .. بە زیندوو و مردووەکانیانەوە .. هەموو گەردوون ڕێکخراوێکی ترپە لێدەر و ئامانجداری پڕ لە جوانی و یاسا و ئاوەزی داهێنەرانەیە ..

بەم شێوەیە ئەو پەیوەندی خزمایەتییەی داروین لە نێوان زیندەوەرەکاندا دۆزییەوە فراوان بۆیەوە و مردووەکانیشی گرتەوە و هەموو گەردوونی کردە ڕێچکەیەکی یەکگرتووەوە .. یەک کرۆک .. وە جیاوازی نێوان شکسپیر کاتێک خەریکبوو هۆنراوەکانی دادەهێنا و .. گوێچکە ماسی کاتێک صەدەفەکەی دروست دەکرد و .. ماددەی بێگیانیش بلورە ئەندازەییەکانی .. تەنها دەبنە جیاوازی لە پلەدا ..

گـەردوون هەرەمێکـە مـرۆڤ چـوار مشـقی لەسـەر لوتکەکـەی دانیشـتووە ..

وەلـێ هـەر بەردێـک لـە بەردەکانـی هەرەمەکـە قۆناغێکـە لـەم سیسـتمە ناوازەیـە کـە کۆتـا تـاج لەسـەر نانەکـەی مـرۆڤ بـوو ..

ئەمـەش تـاج لەسـەر نانێکـی کاتییـە .. چونکـە بـوون بەردەوامـە لـە داهێنـان و لـە داهاتـوودا بـەرز دەبێتـەوە بـۆ سـەرکەوتووتر و سیسـتماتیکی تـر و ڕوحـی تـر لـە مـرۆڤ ..

مـن چـاوم بـە گەردووندا گێڕا .. لـە بچووکترین گەردیلەکانییـەوە بـۆ قەبەتریـن جۆرەکانـی و .. لـە ئایەختریـن میکرۆبەکانییـەوە تـا بەرزتریـن بوونەوەرەکانـی .. وە لـە گڵەکەیـەوە بـۆ ئاڵتـون و ئەڵماس و مروارییەکانـی .. سیسـتمم بینـی .. جوانیـم بینـی ..

خودا لە هەموو گەردووندا دەدرەوشێتەوە ..

## ١





## ڕوح

ئەگەر من خودی برسییەتی بم ئیدی چۆن برسییەتی کۆنترۆڵ بکەم ..

تۆ کێیت ..

ئێوە کێن ..

ئێمە کێین ..

لە ڕوانگەی سادەکردنەوەیەکی زۆر ماددەییەکان دەڵێن ئێمە هیچ نین جگە لە جەستەمان .. دەژین و .. دەمرین .. دواتر هیچ .. پێشتریش هیچ ..

ئەو جەستەیەی لە ڕابردوودا و .. لە ئێستا دا هەیە .. سبەینێ شی دەبێتەوە بۆ گڵ .. پاشان بابەتەکە تەواو دەبێت چونکە دونیا هیچ شتێکی تێدا نییە جگە لە ماددە .. لە سەرەتادا ماددە بوو پاشان پەرەی سەند و بوو بە مرۆڤ .. سبەینێش

مـرۆڤ دەمرێـت و پـەردەی کۆتـا بەشـی شـانۆییەکە لا دەدرێـت .. ئەمانـە ڕاسـتی بابەتیـن .. بـا ئێمـەش بابەتـی بیـن .. هەمـوو شـتێکیش هـەر بابەتییـە و .. جەسـتەش شـتێکی زۆر بابەتییـە و قابیلـی خوێنـدن و پشـکنین و توێکارییـە ..

ئەمە چارەسەرە ئاسانەکەیە .. زۆر ئاسانەکە ..

وە ئـەوەی ئـەم قسـەیە دەکات خـۆی ناخاتـە ژێـر بـاری تەنانـەت یـەک سـەیرکردنێکی ژێـر پێستیشـەوە .. تەنانـەت یـەک سـەیرکردنی نـاو ناخـی خـۆی ..

خـۆ ئەگـەر پێـی بڵێیـت کـە جەسـتە مـرۆڤ نییـە و لەنـاو جەستەدا نەفسێک هەیـە کـە بـەلای خاوەنەکەیـەوە شـتێکی بابەتـی نییـە، بەڵکـو حەقیقەتێکـی خودییـە و لـە مرۆڤـدا هەمیشـە خودێـک هەیـە بەرامبـەر بـە بابـەت .. پێـت دەڵێـت خـود چییـە .. نەفـس چییـە .. ئەوانـە تەنهـا هانـدەری برسـییەتی و تـرس و سێکسـن .. ئەوانـە تەنهـا ئـەو ئاگادارکەرەوانـەن کـە جەسـتە بەهۆیانـەوە درک بـە پێداویسـتییەکانی دەکات .. وە تەنهـا پاشـکۆی لاوەکیـن بـۆ بوونـی و خزمەتکاریـن .. نەفسـیش بـە هەموویـەوە هـەر تەنهـا کۆمەڵێـک پەرچـە کـردارە کـە هەمـوو ڕۆژێـک کۆمـەڵ دەبـن لـە ئەنجامـی پێکدادانـی جەسـتە لەگـەڵ ژینگـە و بارودۆخەکەیـدا .. وە لـە کۆتایـدا دەتوانێـت ببێتـە بابەتێکـی دیکـە ..

بابەت بەلای کێوە ؟

بابەت بەلای ئەوانی ترەوە ؟؟ .. جا چۆن لە کاتێکدا خەڵک نە دەیبینن و نە درک بە بوونیشی دەکەن تەنها هەڵێنجاندنێک نەبێت لە ڕووکەشی ڕەفتارەکانی کە زۆربەیان درۆن .. چونکە هەریەک لە ئێمە نواندن دەکات لەبەردەم خەڵکیدا تەنانەت نواندن لەبەردەم خۆشیدا و ، ڕەفتارە بەر چاوەکانی زۆر کەم گوزارشتی لێدەکەن ..

یاخود بابەتییە بەلای خاوەنەکەیەوە ؟!

وە هەر جارێک خۆی وەکو بابەتێک وەربگرێت سارد دەبێتەوە و لەژێر چەقۆی نەشتەرگەریدا دەبێتە جەستە و خۆی لێدەشارێتەوە و لە دەستی هەڵدێت چونکە ناکرێت ببێتە بابەت و ناکرێت بکرێتە ژێر وردبینەوە هەروەکو کاغەز و درەختێک .. چونکە کرۆکەکەی بە پلەی یەکەم لە خودییەکەیدایە، وە حەقیقەتەکەی ئەوەیە کە ڕوویەکی دیکەی وێنەکەیە، خودە لەبەرامبەر ئەو جەستەیەدا کە بابەتە .. وە هەردوو جەمسەرەکە خود و بابەت دوو ڕووەکەی حەقیقەتن .. جا ئەگەر زانیمان ماددە هەموو شتێکی بابەتییە کەواتە هەر دەبێت دان بەوەدا بنێین کە لە بووندا شتێکی دیکەش هەیە جگە لە ماددە و ڕووەکەی دیکەی حەقیقەتە، ئەویش خودە ..

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ئەو پێناسە ساویلکانەیەی خود و نەفس کە دەڵێت تەنها هاندەری برسییەتی و سێکس و ترس و ئەو ئاگادارکەرەوانەن کە جەستە بەهۆیانەوە دەزانێت تونییە یاخود برسییە یاخود تامەزرۆیی سێکسی هەیە .. ئەوا ئێمە دەکەوینە

بەردەم ڕاڤەیەکی گەمژانەی زۆر کەم و کورت چونکە ئەمە نە حەقیقەتی نەفسە و نە حەقیقەتی مرۆڤ ..

مرۆڤ قوربانی بە پاروو و ماڵ و جێگە گەرم و گوڕەکەی دەدات لە پێناو ئامانج و مەبەستگەلێکی زۆر پەتی وەکو دادپەروەری و ڕاستی و ئازادی، ئەدی کوا هاندەرەکانی برسییەتی و سێکس لێرەدا .. تەنانەت ئەو کرێکارە پرۆلیتارییەشی کە لە ڤێتنام و لەسەر تۆپهاوێژەکەی گیان دەسپێریت لە پێناو سبەینێیەک کە هێشتا نەهاتووە .. سەلماندنێکی یەکلاییکەرەوەیە کە نەفس و خود حەقیقەتێکی دراوسێ و بەرزترن لە جەستە و تەنها پێداویستی جەستەیی هەستی پێچەوانەکراوی سەر ئاوێنەیەکی ناوەکی نین .. ئەو ویستە مەزنەی پێ بەسەر جەستەدا دەنێت و دەیکاتە قوربانی، حەقیقەتێکی شان بە شان و بەرزە لە سروشتی خۆیدا و فەرماندەر و بە هەژموونە بەسەر جەستەدا نەک پاشکۆ و کلکی جەستە ..

وە ئەگەر من خودی برسییەتی بم ئیدی چۆن برسییەتی کۆنترۆڵ بکەم .. تەنها هەژموونی ناوەکی بەسەر هەموو توخمە جەستەییەکان و یەکەکانی ئارەزوو، دەرخەری ئەو توخمە بەرز و جیاوازەیە کە خودی مرۆڤی لێوە پێکدێت ..

لە ڕێگەی نەفسەوە جەستە کۆنترۆڵ دەکەم ..

لە ڕێگەی ئاوەزەوە جەستە کۆنترۆڵ دەکەم ..

وە لە ڕێگەی بینابییەوە سنوور بۆ ئاوەز دادەنێم ..

ئـەم جیاکارییـە لـە نێـوان بـوون و نەبوونێکـدا کـە سـەردەکەوێت بەسـەریدا و کۆنترۆڵـی دەکات ئـەو سـەلماندنە واقیعییەیـە کـە بـەرەو ڕوحـم دەبـاتِ وەکـو حەقیقەتێکـی شـان بـە شـانی جەسـتە و بڕیـاردەری سـەری نـەک کلـک و پاشـکۆیەک کـە بـە مردنـی جەسـتە ئەویـش بمرێـت ..

وە ئـەو کەسـەی دەڵێـت مـرۆڤ کۆمەڵێـک فرمانـی فسـیۆلۆژی و ماددییـە و هیچـی تـر .. دەبێـت بۆمـان ڕاڤـە بـکات کوانـێ ئـەو مرۆڤـە لەکاتـی خـەودا ..

لـە کاتـی خـەودا هەمـوو فرمانـە فسـیۆلۆژییەکان لـە کاردان و بەردەوامـن و هەمـوو کـردارە پێچەوانـەکان بە ڕێک و پێکی ڕوودەدەن، وە ئەگـەر دەسـتیت بـە دەرزییـەک ڕووشـاند لێـت دووردەکەوێتـەوە .. بـە هەمـان شـێوە دڵیـش لێدەدات و هەناسـە دەدرێـت و ڕژێنـەکان دەردەدەن و ناوهەنـاو لـوول دەخـۆن و ئەندامەکانـی زاوزێ کاردەکـەن .. لەگـەڵ ئەوەشـدا ئێمـە لـە بەرامبـەر مرۆڤێکـی نووسـتووداین کـە زیاتـر لـە درەختێـک دەچێـت .. تەنهـا درەخـت یـان ئاژەڵێـک .. یاخـود ژیانێکـی سـەرەتایی کـە جیـاوازی نییـە لەگـەڵ ژیانـی مێروویـدا .. کەواتـە کـوا مـرۆڤ ..

نووسـتن و پاشـان هەسـتان نموونەیەکـی بچووککـراوەی مردنـە .. دواتـر زیندووبوونـەوە جارێکـی دیکـە ئـەو تۆخمـە بـەرزە ئاشـکرا دەکات کـە بـە ئامادەیـی لـەو لاشـە نووسـتووەدا، کـت و پـڕ و بـێ هیـچ پێشـەکییەک هیتلـەر و نیـرۆن و کالیگـۆلا دروسـت دەکات .. ئیـدی ئـەو ڕاکێشـراوە وەکـو گایەکـی سسـت خەبـەری دەبێتـەوە تـا

بکوژێت و بجەنگێت و تێک بشکێنێت و لەناو ببات .. جیاوازییەکی زۆر گەورەیە .. گەورەتر لەوەی بەتەنها گۆڕانکارییەکی ماددی لە چەند ساتێکدا ڕاڤە بکرێت ..

سادە کردنەوەی تەوەزەلانە و گەڕان بەدوای ئاساندا بۆ لە کۆڵکردنەوەی کێشەیەک بێ وەڵام .. ئەو هۆکارەیە کەوای لە ماددییەکان کردووە ئەم وێنا کردنە گەمژانەیە بۆ مرۆڤ بکەن و بڵێن جەستە و کۆمەڵێک پەرچە کردارە و مرۆڤ لە گڵەوە دێت و بۆ گڵ کۆتایی دێت .. منیش تێناگەم چۆن دەروونیان ڕێگەیان پێدەدات باوەڕ بەم نوکتەیە بکەن .. لە جیهانێکی ناوازە و پتەودا کە هەر گەردیلەیەکی گەواهی ڕێک و پێکی و جوانی دەدەن و تیایدا هۆکارەکان ڕیز دەبەستن بەرەو ئامانجەکان و .. مەرگ و ژیان خزمەت دەکەن و .. هەموو ساتێک مرۆڤ بە خوێنی خۆی قوربانی بۆ پەتیترین ئامانج و پێشەنگەکان دەدات و .. هیچ شتێک بێ هودە ناڕوات ..

جا چۆن مرۆڤ لە کاتێکدا بەڕێزترینی دروستکراوەکانە .. بێ هودە دەڕوات و .. لەخۆڕایی لەناو دەچێت ..

جارێکی دیکەش لەبەردەم تێبینییەکی دیکەدا دەوەستین کە شایەنی تێڕامانە ئەویش ئەو تایبەتمەندییەیە کە جووڵەی پێ جیا دەکرێتەوە ..

ناتوانیت درک بە جووڵە بکەیت کاتێک لە هەمان خولگە لەگەڵیدا دەجوڵێیت .. وە دەبێت لەسەر لێوارێکی دەرەکی بوەستیت تا بتوانی تێبینی بکەیت .. هەر بۆیە کاتێک لە

ئەسانسۆردایت ساتێک دێت بەسەرتدا نازانی ئەسانسۆرەکە وەستاوە یا دەجوولێت .. چونکە تۆ بوویتەتە بەشێک لە جوولەکەی .. ناتوانیت درک بەم جوولەیە بکەیت مەگەر لە دەرگای ئەسانسۆرەکەوە تەماشای شۆستە جێگیرەکەی دەرەوە بکەیت ..

هەمان دۆخ بۆ شەمەندەفەرێک کە بە نەرم و نیانی بەسەر هێڵەکەیدا دەڕوات .. ناتوانیت درک بە جوولەی نموونەی ئەم شەمەندەفەرە بکەیت مەگەر ساتی دەست پێکردنی جوولەکەی یاخود ساتی وەستانی یاخود کاتێک لە پەنجەرەکەوە تەماشای شۆستە جێگیرەکەی دەرەوە دەکەیت ..

بە هەمان شێوە ناتوانیت تێبینی جوولەی خۆر بکەیت ئەگەر لەسەری بیت بەڵام دەتوانیت لە مانگ و زەوییەوە تێبینی بکەیت .. هەروەک چۆن ناتوانیت تێبینی زەوی بکەیت کاتێک لەسەری نیشتەجێیت بەڵکو دەتوانیت لە سەر مانگەوە ئەمە بکەیت ..

ناتوانیت پەی بە بارودۆخێک بەریت تەنها مەگەر بچیتە دەرەوە لێی ..

پرۆسەی درک پێکردنیش سەلماندنێکی دڵنیایە بۆ ئەوەی کە لەهەر ساتێکدا دوو شت هەیە .. شتە درک پێکراوەکە و نەفسە درک پێکەرە دەرەکییەکە .. هەربۆیە نەماندەتوانی درک بە کات بکەین ئەگەر بەشە درک پێکەرەکەمان لەسەر لێوارێکی جیا کراوە و لە دەرەوەی تێپەڕینی بەردەوامی کاتەوە نەبوایە .. وە ئەگەر درک پێکردنمان هەموو ساتێک لەگەڵ میلی چرکەکاندا

بازی بدایە ئەوا هەرگیز نەماندەتوانی درک بەم چرکانە بکەین .. وە درک پێکردنمان نەدەپچڕان هەروەک چۆن چرکەکان تێدەپەڕن و دەبڕێنەوە بێ ئەوەی هەست بە هیچ شتێک بکرێت ..

ئەمەش ئەنجامێکی سەرسوڕهێنەرە و داخوازی وەستانێکی پڕ لە تێڕامانە بۆ ماوەیەکی درێژ ..

ئێمە ئەوەتاین لەبەردەم حەقیقەتێکی مرۆڤانەدا، بەشێکی نقوم بووە لە کاتدا و لە گەڵیدا تێدەپەڕێت و گەورە دەبێت و پیر دەبێت ( ئەویش جەستەیە ) و بەشێکی دیکەی لە دەرەوەی ئەم کاتانەیە و لە لێوارێکی ئارامیدا تێبینی دەکات و بە بێ ئەوەی گیری تیا بخوات درکی پێ دەکات بۆیە ئەمیان نە پیر دەبێت و نە گەورە دەبێت و نە دەشبڕێتەوە ..

وە ئەو ڕۆژەی جەستە دەکەوێتە ناو گڵەوە ئەم وەکو خۆی دەمێنێتەوە و زیندووانە ژیانە تایبەتەکەی خۆی دەژی .. ژیانە ناکاتییەکەی .. هیچ ناوێکیش بۆ ئەم بەشە نادۆزینەوە جگە لەو ناوەی ئاینەکان پێمانی دەڵێن .. ڕوح ..

هەریەک لە ئێمە دەتوانێت دەست بدات لەم بوونە ڕوحییەی ناخی .. وە درک بەوە بکات کە بوونێکی جیاوازە لە جۆردا لەو بوونە دەرەکییە ترپە لێدەرە گۆڕاوەی کە لە تاقیگەی گۆڕانکاریدا و لە چواردەورماندا ورووژم دەکات ..

هەریەک لە ئێمە دەتوانێت هەست بکات کە لە ناخیدا دۆخێکی ئامادەگی و بەردەوامی و بەرجەستە بوون و کەسێتی و بوونێکی

ئامادەی تـەواو جیـاواز لـە بوونـە دەرەکییـەی هەیـە ..

ئـەو بوونـەی لـە چواردەورمانـدا لـە چەندیـن تاڤگـەی گۆڕانکاریـدا وروژم دەکات ..

ئـەم دۆخـە ناوەکییـەی لـە سـاتەکانی ئاگاییـدا درکـی پێدەکەیـن و نـاوم نـاوە دۆخـی ئامادەگـی .. ئـەو کلیلەیـە کـە دەمانبـات بـەرەو بوونـە ڕوحییەکـەی نـاو ناخمـان و دەسـتمان دەخاتـە سـەر ئـەو مەتـەڵەی نـاوی ڕوحـە .. یـا ڕەهـا .. یاخـود داماڵـراو و پەتـی ..

وە کاتێـک ئێمـە درک بـە جوانـی دەکەیـن و جیـای دەکەینـەوە لـە ناشـیرینی و .. درک بـە ڕاسـتی دەکەیـن و جیـای دەکەینـەوە لـە بەتـاڵ .. درک بـە دادپـەروەری دەکەیـن و لـە سـتەمی جیـا دەکەینـەوە .. ئـەوا هەمـوو جارێـک بـە پێوەرێـک دەپێویـن .. بـە ڕاسـتییەکی جیاکـراوە لـەو ڕووداوەی دەپێویـن .. خـۆ ئەگـەر ئێمـە لەهەمـان لێـوارەوە پێوانـە بکەیـن .. لێـواری ڕوح .. ئـەوا ویژدانیـش ئامـاژە بـە بوونـی ڕوحـی دەکات .. هەسـتی جوانیـش ئامـاژەی پێـدەکات .. هەروەهـا ئـەو هەسـتە شـاراوەیەش کـە ڕاسـتی و بەتـاڵ و سـاختە و حەقیقـەت لەیـەک دەکاتـەوە، ئامـاژەی پێـدەکات ..

ئایـا ئـەم لێـوارەی دەرەوەی کات هەتـا هەتاییـە ؟ یاخـود کاتێکـی جیـاوازە و سـاڵنامەی جیـاوازی هەیـە .. ڕۆژێکـی بەهـەزار سـاڵە .. هـەروەک لـە قورئانـدا هاتـووە ((إِنَّ يَومَـاً عِنـدَ رَبِّـكَ كَأَلْـفَ سَـنَةٍ مِـمَّا تُوعَـدُونْ ))[1] و هـەروەک چـۆن لەبـارەی ڕۆژەکانـی خـوداوە هاتـووە .. ئەوانیـش ڕۆژانێکـن جیـاواز لـە ڕۆژەکانـی ئێمـە و ڕاڤـەکاران زۆر

---

١ )الحج ٤٧, واتە: بەڕاستی ڕۆژێکی پەروەردگارت بەئەندازەی هەزار ساڵی ئێوەیە

ڕاڤەیـان بـۆ کـردووە و هـەر ڕێبـازە و ئـەو هەمـوو وردەکارییانـەی ناتوانرێـت درکیـان پـێ بکرێـت .. وە زۆربـەی جـار تەنهـا ئامـاژە و هێمـان، ئامـاژە دەدەن و ڕوون ناکەنـەوە و , هێمـای شـتێکن و ڕاڤـە ناکـەن .. چونکـە ڕونکردنـەوەی ڕوح و پەرسـتگاکەیەتی , کارێکـە لەسـەرووی درک پێکردنـی ئێمـەوە .. وەلـێ حوکـم دان بـە بوونـی کارێکـی مومکینـە و پێویسـت و زەرووریـیـە .. وە ڕەنگـە ڕوح ئـەو مۆرکـەی چاکـی و جوانـی بێـت کـە دروسـتکار وەکـو جێدەسـتی خـۆی لەهەریەکەمانـدا جێیهێـڵاوە ..

وە ڕەنگـە لـە ڕوحـی خـۆی بێـت بـەو پێیـەی لـە ڕوحـی خـۆی کـردووە بـە بەرمانـدا .. خـەڵات و فوێکـە لـەو .. پریشـکێکی پیـرۆزە لـە نوورەکـەی و تیشـکێکە لـە خـۆرە هەتـا هەتاییەکـەی وە ئەمـە هەمـان ئـەو وێنەیەیـە کـە ئایینـەکان بۆیـان وێنـا کردوویـن و .. جوانتریـن و نزیکتریـن وێنەشـە ..

زۆر دوورناکەوینـەوە ئەگـەر بزانیـن ئـەم ڕوحـەی ناخمـان ئازادییـە .. ئازادییـە ناوەکییـە قـوڵ و هەناوییەکەمـان لـە قوڵایـی نهێنـی دا .. ئـەوەی کـە خـودا ویسـتوویەتی ئازادبـێ لـە هەمـوو کۆت و بەندێـک و لـە هەمـوو هاوردەیەکـی نامـۆ پاراسـتویەتی و سـەربازەکانی لـە دەرەوەی دانـاوە و کردوویەتـی بـە پیرۆزترینـی پیرۆزییـەکان و پیرۆزییەکـی قەدەغەکـراو لـە هەمـووان جگـە لـە خاوەنەکـەی ..

ئێمە لە قوڵایی نهێنی و شـاراوەییەکانماندا ویسـتمان هەیە هەروەک ویسـتی خـودا و هەڵدەبژێریـن هـەروەک چـۆن خـودا هەڵدەبژێرێـت هـەر بۆیـە کردینـی بـە جێنشـین لەسـەر زەوی و کردوینـی بـە خـودای

بچووکـی سـەر زەوی و حوکـم دەکەیـن و ئەمەشـی کـردووە بـە بـەڵا و تاقیکردنـەوە و ئەزمـوون و پرۆڤەیـەک کـە دواتـر پرسـیار و لێپرسـینەوە و دووبـارە ڕێکخسـتنەوەی ئاسـتەکانی بـەدوادا دێـت و هەریەکـەو دەخرێتـە ئـەو ئاسـتەوە کـە سەرسـەختانە شـایەنییەتی ..

ناوچـەی نهێنـی و شـاراوە ناوچـەی ئـازادی و بەرپرسـیاریەتییە ( انمـا الاعمـال بالنیـات وانمـا لـکل امـرئ مـا نـوی )[٢] .. ناوچـەی نیـاز و شـاردنەوە .. ئـەو ناوچەیەیـە کـە خـودا بـە زانسـتی خـۆی تێبینـی دەکات و لێپرسـینەوەی لەسـەر دەکات چونکـە ناوچـەی ئازادییـە .. وە زۆر لێکـردن و کـۆت و بەنـدەکان ئەوکاتـە دەسـت پێدەکـەن کـە لـە شـاراوەوە دەردەپەڕێـت بـۆ کار و پاشـان جێبەجـێ کـردن و بەدیهێنـان لـە جیهانـی ماددیـدا .. ئـا لێـرەدا ئازادییـەکان دەکێشـن بەیەکدا و بـە بارودۆخـی ژینگـە و بـە کۆمەڵگـەدا و هەروەهـا ویسـتی خوداییـش دەسـتێوەردەدات تـا سـنوور بـۆ خراپـەی خراپـەکار دابنێـت و بـوار بـۆ چاکـە برەخسـێنێت و زەرەرمـان بـۆ یەکـدی کەمتـر بکاتـەوە بـە داخـوازی ئـەو سـۆزەی هەیەتـی و هەریەکـەو بـە پێـی ویـژدان و شایسـتەیی کۆمەکـی بـکات بـە برێکـی زۆر لـە تواناکان ..

لەبەرئـەوە بـۆ مـن یـەک شـتە گـەر بڵێـم خـودا ڕوحێکـی بـۆ دروسـت کـردووم و گـەر بڵێـم خـودا منـی بـە ئـازادی و وەکـو ئـازادی دروسـت کـردووە .. یاخـود بڵێـم منـی بـە تاکێکـی تەنهـا دروسـت کـردووە چونکـە هەریـەک لـەم دەربڕینانـە ئـەوی دی ڕوون دەکاتـەوە .. وە لـە قوڵاییـەوە ئـەو شـتانە وەسـف دەکـەن کـە ناتوانـم بـە چـاو

---

٢) واتـە : کـردەوەکان بـە پێـی نیازەکەیـان هەڵدەسـەنگێندرێن و هەرکەسـیش ئەوەی بـۆ هەیـە کـە نیـازی بـوو

بیـان بینـم یاخـود بەدەست دەسـتیان لێبـدەم .. یاخـود وشـە و زاراوەیـان بـۆ بدۆزمـەوە ..

وە لـە ناوچـەی ڕوحـدا لـە ئامـاژە زیاتـر هیچمـان دەست ناکەوێـت

بـەو پێیـەی ئێمـە لـە لێـواری دەرەوەی کات و دەرەوەی هەمـوو شـتێکی هەسـت پێکـراو و بینراویـن ..



# الله (خودا)

یەکییەتی شانەی بوونەوەران نیشانەی یەکی دروستکارە ..

بیست ساڵ لەمەوپێش .. لە ژووری توێکاری کۆلێژی پزیشکیدا دەوەستاین .. هەر چوار کەسە و لەبەردەم بەشێک لە بەشەکانی لاشەدا ..

ئەوکات ئێمە واماندەزانی کە حەقیقەتی مرۆڤ مەتەڵ نییە و .. چەقۆی نەشتەرگەر دەتوانێت بە یەک لێدان ئاشکرای بکات و .. جەستە تەنها جانتایەکە کە کردتەوە هەموو شتێکت زانیووە ..

بەڵام دوو ساڵی دوور و درێژ تێپەڕی .. من هەر خەریک بووم دەگەڕام و تەماشای پشت گۆشت و ئێسک و .. ریخۆڵەکان و ملوولەکان و کرکراگەکانم دەکرد .. بە بێ هودە بۆ ئەو حەقیقەتە دەگەڕام .. دڵم کردەوە .. دوو سییەکەم کردەوە .. تا کۆتاییەکەی بەدوای دەمارەکاندا ڕۆشتم .. لەگەڵ درکە پەتکدا تا

مێشک ڕۆشتم .. مێشکم کرد بە دوو بەشەوە .. هەر بەشێکیشم کرد بە دوو نیوەی تر .. وە لەکۆتاییدا گەشتم بە بارستەیەکی نەرمی مەڵهەمی سپی .. مامۆستاکە دەربارەی وتی .. کە ئەوە نهێنی مرۆڤە ..

هەر بەڕاست ؟

ئایا ئەوە لێرەدایە ئازار نیشتەجێیە و .. چێژ ڕاکشاوە و .. ویست نوستووە ..

لەم بارستە نەرمە شێدارەدا ..

وە بە دڵەڕاوکێ و گومانەوە سەرم بەرز کردەوە ..

من جانتاکەم کردەوە و .. جانتایەکی دیکەم تیا دۆزییەوە ..

ئێستاش دوای دوو ساڵ لە ماندوویی و شەکەتی هەر وەستاوم بەو پێیەی من لەبەردەم نەزانراوێکدام .. ئەو ماسکەی مرۆڤ دادەپۆشێت تەنها جلەکانی نییە .. پێستەکەشی جلە .. گۆشت و بەز و ئێسکەکانی هەموو جلن .. وەلێ خودی خۆی دوورە .. دوور .. لە ژێر ئەم قوماشە ئەستوورانەوە لە تەبەقێکی گەورەی پێستتدا ..

قسەیەکی ناڕاستە .. لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزمدا بۆ هەوڵەکانی بەڕێزان ( کنگهام و گرای و گامیسۆن ) و کۆی هەموو بلیمەتەکانی دیکەی زانستی پزیشکی کە پسپۆڕییان لە وەسفی مرۆڤدا هەبوو ..

ئـەوان هەرگیـز وەسـفی مرۆڤیـان نەکـرد .. بەڵکـو وەسـفی جلەکانیـان کـرد ..

لـە چاوی منـدا ئەوانـە تەنهـا نەخش و دوورمانێکـی سـەردەمیانەن .. داهێنانیـان لـە وەسـفی مـۆدەی ڕیخۆڵەکانـدا کـردووە ..

دڵـە پارێزراوەکانـی نـاو شوشـەکانی مۆزەخانـەی کۆلێـژی پزیشـکی .. تابلـۆی وردەکاری جیـاوازی دڵـن ..

دڵی دیکۆلتێ[1] و .. دڵی یابانی ..

بـەڵام دڵـی ڕاسـتەقینەی مـرۆڤ .. هەسـتەکانی و خوێنـە گەرمـە پـڕ لـە ئارەزووەکـەی .. جگـە لـە ناخـی ئێمـەی زینـدوو .. لـە هیـچ شـوێنێکی تـردا دەسـتناکەوێت ..

حەقیقەتی ژیان نەزاندراوە ..

ژیان جووڵەیەکە لە ماددەدا ..

جووڵەیەکـی بـە ئـاگای ئامانجـداری ئـازاد .. وە کـەس سروشـتی ئـەم جووڵەیـە نازانێـت .. بـەڵام هـەر چۆنێـک بێـت جەسـتە نییـە ئیـدی ..

کاتێـک ئامێرەکانـی جەسـتە کاردەکـەن لـە بووکەڵـەی شـانۆیی دەچـن .. لـە دوورەوە بـۆ بینـەر وەکـو ئەندامـی زینـدوو دەردەکـەون .. وا دەردەکـەوێ کـە بـە هەڵبـژاردە و ئـازادی خـۆی قسـە بـکات

١)دیکۆلتێ : بەشـی سـەرەوەی سنگی ئافرەتـە کـە مـل و هـەردوو شـانیش دەگرێتـەوە و لـە مۆدەکانـی هەندێـک جلـدا دەردەخرێـن

.. بەڵام لە ڕاستیدا جەستە تەنها پارچە تەختەی مردووە و لە پشتەوە و بە شاراوەیی دەزووی شاراوە دەیجوڵێنێ لە ناو ئێمەدا بووکەڵەی شانۆیی هەیە ..

لەناو ئێمەدا کەڕەنا لێدەرێک هەیە فوو بە کەڕەنای جەستەماندا دەکات و .. یاری بە دەزووەکانی پەلەکانمان دەکات جا دەجووڵێن و ڕێ دەکەن و قسە دەکەن .. هەموو گەردوونیش بەهەمان شێوە .. ئاژەڵ و ڕووەک و بێگیان .. چەند ین کەڕەنا لەناویاندایە .. لە دڵیاندا کەڕەنا لێدەر هەیە .. بەبەردەوامی فووی پیا دەکات ..

بەراهیمییە هندییەکان باوەڕیان وانییە کە هەر بوونەوەرێک ڕوحێکی تایبەت بە خۆی هەیە .. پێیان وانییە هەر گوێدرێژە و ڕوحێکی هەیە .. وە هەر سەگە و ڕوحێکی هەیە .. بەڵکو باوەڕیان بە بوونی یەک کەڕەنا لێدەر هەیە کە فوو بە هەموو کەڕەناکانی گەردووندا دەکات و یەک ڕوحی تێدایە ..

وە هەموو بوونەوەران یەک مانا بەدی دەهێنن .. هەروەک چۆن وشە جۆراوجۆرەکان .. یەک بیرۆکەی سادە بەدی دەهێنن .. هەروەک چۆن وێنەکێش و موزیک ژەن و داتاشەر و ئەدیب و شاعیر .. لە لێشاوێک لە بوونەوەرانی هونەری یەک مانا بەدی دەهێنن ..

وە لە سوفورەکانی یوبانیشاددا، نوێژێکی هیندی کۆن هەیە ئەم واتایە لە چەند دێڕە هۆنراوەیەکی ناسکدا ڕوون دەکاتەوە .. خوداوەند براهما کە لە دڵی زانادا جێنشینە , چرپە دەکات و دەڵێت :

گەر بکوژ پێی وابێت بکوژە و کوژراو پێی وابێت کوژراوە ..

ئەوا ئەوان شێوازە شاراوەکانی من نازانن

لە کاتێکدا من دەبمە سینگ بۆ ئەو کەسەی دەمرێت و

چەک بۆ ئەو کەسەی دەکوژێت و

باڵ بۆ ئەو کەسەی دەفرێت ..

وە بۆ ئەو کەسەی گومانی لە بوونم هەیە

دەبمە هەموو شتێک تەنانەت خودی گومانیش

وە من یەکم و من هەموو شتەکانم ..

ئـەو خودایەکـە لـە ڕووناکـی سـپی دەچێـت .. تـاک و سـادەیە بـەڵام لـە ناخیـدا هـەر حـەوت ڕەنگەکـەی پەڵکـە زێڕینـەی لەخـۆ گرتـووە .. ئـەو کۆرپەلەیەکـە و تـۆوی هەمـوو سیفەتەکانی لـە خـۆ گرتـووە ..

هیندییـەکان هەمـوو بوونەوەرانیـان کردۆتـە ( هەمـوو ) یەکـەوە وە پێیـان وایـە ئـەم هەمـووە یـەک ڕوحیـان هەیـە و .. ناویـان نـا براهمـا ..

براهمـاش هـەر ئەوەنـدەی لەسـەرە فـوو بـکات بـە کەڕەناکـەدا و دەزووەکانـی دەسـتی بجوڵێنێـت ئیـدی بووکەڵەکانـی سـەر شـانۆکە هەمـوو دەجوڵێـن ..

براهما عەرشی نییە و تەرازووی نییە .. نە لێپرسینەوە دەکات و نە سزا دەدات لە بنەڕەتدا ئەو تەنانەت هەر کەسێک نییە .. بەڵکو تەنها حەقیقەتی بوونە ..

گومانیشی تێدا نییە ئەم فەلسەفە هیندییە کۆنە دووبارە گەڕاوەتەوە و هاتووە لە دەیان ڕێبازی ئەوروپیدا زیندوو بووەتەوە .. بە بێ گۆڕانکاری لە هیچ شتێکدا جگە لە ناوەکەی ..

ئەوەی هیندییەکان پێیان وت براهما .. شۆپنهۆری ئەڵمانی باوەڕی پێی هەبوو و ناوی نا ویست و نیچە باوەڕی پێی هەبوو ناوی نا هێز و مارکس باوەڕی پێی هەبوو ناوی نا ماددە .. برگسۆن باوەڕی پێی هەبوو ناوی نا وزەی زیندوو و هەروەها هیگڵیش باوەڕی پێی هێنا و ناوی نا ڕەها ..

هەموویان ئەوەیان وت کە بودا زیاتر لە پێنج هەزار ساڵ لەمەوپێش وتی :

من لاهوتێکی بێ خوداتان پێشکەش دەکەم .. وە زانستێکی دەروونی بێ دەروون و .. دونیایەکی بێ دواڕۆژ .. وە خودای من کەسێک نییە .. پاشاش نییە .. دروستکاری شتەکانیش نییە بەڵکو خودی شتەکانە ..

وە بودا لە وەڵامی ئەو هەژارەدا کە لێی پرسی : ڕوح چییە ؟ وتی :

ئەمە ئەوپەڕی تێڕامانی تیۆرییە کوڕم .. ئەمە بیابانێکە و .. منیش پاڵەوان نیم ..

تەوەرەی ئەم فەلسەفە هیندییە کۆنەش ئەم دێڕەیە .. خودا تاکە و خودا شتەکانە .. وە شتێک نییە بەناوی دروستکار و دروستکراو بەڵکو (هەموو) هەیە .. هەموو لەوێیە و خوداش ڕوحی هەمووە ..

لەم دێڕەشدا تێکەڵکردنێکی ڕوون هەیە .. هەروەها ڕەشە کوژی ئەنجامگەلێک کە هیچ پێشەکییەک نابێتە هۆکاری ..

هەموو ئەوەی توێژینەوەی زانستی توێکاری دەربارەی ژیان و زیندەوەران دەیڵێت کە .. تاک شانەیی و بەند و خزمایەتی و پەیوەندییەکی سۆزداری هەیە لە نێوان گشت بوونەوەراندا تەنانەت لەنێوان زیندوو و مردوودا .. لەنێوان پێکهاتەی ئەستێرە و مەجەڕڕەکان .. پێکهاتەی درەخت و ئاژەڵەکان ..

ڕێک وەکو ئەوەی کۆمەڵێک وێنە ببینیت کە یەک شێواز و یەک خامی ڕەنگ و شێوەی پەڕەی هاوشێوەیان هەبێت .. سەرەنجامی ئاسایی ئەوەیە بڵێیت .. نموونەی ئەم تابلۆیانە بێگومان یەک وێنەکێش کێشاونی .. تەنها ئەو بە تەنها دروستی کردوون و هیچ هاوبەشێک هاوبەشی نەکردووە ..

بەلام ئەگەر تۆ بێیت باز بەسەر ئەم تێبینییەدا بدەیت و بڵێیت ئەم تابلۆیانە وێنە کێشراو و وێنەکێشن و دروستکارێکیان نییە .. ئەوا نموونەی ئەم بازدانە خراپ بەکارهێنان و ستەمێکە

هیچ لۆژیکێکی نییە و هیچ پێشەکییەک پاساوی بۆ ناهێنێتەوە و .. هۆکارەکەی تێکەڵکردنی تاک بوونەوەری و تاک بوونە ..

وە دانانی بوونەوەری دیاریکراو و سنورداره لە هەمانکاتدا بە بوونی ڕەهای بێ سنوور ( خودا ) ..

هەڵەی دووەمیش ئەوەیە پێت وایە هەستەکانت کۆتا دادوەرن بۆیە ڕەتت کردەوە جیهانێکی دیکە جگە لە جیهانە نەبینراوەکە هەبێت تەنها لەبەرئەوەی تۆ جگە لەوە نابینیت .. کەواتە هیچ نادیارێک و دواڕۆژێک بوونی نییە .. وە جگە لەم بوونە بەرچاوە هیچی دیکە بوونی نییە و خوداش دڵی ئەم بوونە و حەقیقەتەکەیەتی و کێشەکە چارەسەر بوو .. ئەمەش جۆرێکە لە سادەکردنەوەی کورت و کوێر ..

هیچ شتێک جگە لە وێنە کێشراوەکان بوونی نییە و لە هەمان کاتدا وێنەکێشەکەشە .. وێنەکێشەکەش دڵ و حەقیقەتەکەیەتی و کێشەکە چارەسەر بوو ..

پاشان بڕوابوون بە بوونی یەک ڕوح کە ڕوحی هەمووانە .. وە ڕەتکردنەوەی بوونی چەندین ڕوح بە ژمارەی بوونەوەران .. خراپ بە کارهێنانێکی دیکەیە .. ئەم جارە بازدانێکە لە بۆشاییدا بە بێ پشت بەستن بە بەڵگە و هۆکار .. بەڵکو حوکمێکی دیکەیە بە پاڵنەری سادە کردنەوەی زیاتر ..

وە تەنها لەبەر سادە کردنەوە بیرکردنەوە بە ئەنجامێکی نا قبوڵکراو کۆتایی پێدێت .. ئەویش ئەوەیە خودا یەکە و

شتەکانیشــە ..

وە ئێمــە لەبــەردەم سروشــتێک و یاسـا و کرۆکەکەیدایـن و هیچـی دی .. خــۆ ئەگــەر بپرســی کــێ ئــەم سروشــتەی دروســت کــردووە پێــت دەڵێــن دێرینــە، نــە ســەرەتای هەیــە و نــە کۆتایــی .. ئــەو خودایــە .. ئەزەلــی و هەتــا هەتایــی و تــاک و هەمــە جۆریشــە .. ئەمــەش یاریکردنــە بــە دەربڕینــەکان لــە پێنــاو هەڵهاتــن لــەو دووانەییــەی بوونــی دروســتکار و دروســتکراو دەیســەپێنێت .. وە لــە پێنــاو هەڵهاتــن لــەو هەمەچەشــنییە کرۆکییــەی لــە ئەنجامــی بڕوابــوون بــە چەندیــن ڕوحــەوە دێــت ..

ئــەوە ئایینــە ئاســمانییەکانن تاکــە چارەســەریان پێشــکەش کــردوە کــە بیرکردنــەوەی زانســتی دەیڵێــت و قبوڵییەتــی ..

ئەگــەر توێژینــەوەی زانســتی توێــکاری ژیــان و توێژینەوەی شــیکاری کیمیایــی گڵــی زەوی و هەســارەکان و پێکهێنەرەکانــی ئــاو و هــەوا بۆیــان دەرخســتبین کــە خامــی ئــەم دونیایــە یەکێکــە .. وە ئەگــەر زانســتەکانی پەرەســەندن پێــی وتبیــن کــە پەرەســەندنی زینــدەوەران لــە میکرۆبــەوە بــۆ درەخــت و مەیموونــەکان نیشــانەی بوونــی یــەک شــێواز گەلــی هاوشــێوە و ســوننەت و یاســای چوونیەکــن کــە کار دەکــەن .. ئــەوا ســەرەنجامی ئاســایی ئەوەیــە بڵێیــن کەواتــە بێگومــان هــەر دەبێــت دروســتکاری دونیــا و گــەردوون و ژیــان هــەر یــەک دروســتکار بێــت و هیــچ هاوبەشــێک لــە دروســتکردنەکەیدا هاوبەشــی نەکــردووە .. وە بــە تــەواوی تاکــە لــە دروســت کردنــی دونیــادا .. وە هەرگیــز نەڵێیــن کــە ئــەم دروســتکارە خــۆی دونیایــە .. وە سروشــتە

.. وە خۆی خودی دروستکراوانە ..

وە جارێکی دیکە زانستە یەکلایی کەرەوەکان پێمان دەڵێن کە .. ئەوەی دەکەوێتە بازنەی درک پێکردنی هەستی ئێمەوە هەموو شتێک نییە .. وە جیهان لە دەوروبەرمان پڕە لە بوونەوەرانی نەبینراو و نا بەردەست و نەبیستراو و لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستەقینە و دڵنیان هەر وەک بوونی دڵنیای ئێمە .. نموونەی ئەمە وەکو تیشکی ژێر سوور و تیشکی سەروو بنەوشەیی .. وە شەپۆلە بێتەلەکان [٢] و ڕادار و تیشکی ئێکس ..

ئەم شەپۆلانە بوونیان هەبوو پێش ئەوەشی ئێمە ڕادیۆ و وێستگەی پەخشی مارکۆنی و ئامێری تیشک و ئامێری تیشکی ئێکس دابهێنین .. ئەم شەپۆلانە لە ڕابردوودا و ئێستاش هەر لەخۆرەوە دێن بەسەر ئێمەدا و بۆ ملیۆنەها ساڵ لە دەوری ئێمە بوون بەبێ ئەوەی بیان بینین یاخود پێیان بزانین .. بۆیە باسکردن لە نادیار و فریشتە و بوونەوەرانی نەبینراو شتێکی ئاساییە و .. پێچەوانەکەی نا ئاساییە .. کە هەر شتێک نەیبینین ڕەتی بکەینەوە تەنها لەبەرئەوەی نایبینین لەگەڵ زانیاریمان دەربارەی سنوورداری هەستەکانمان .. ئەمە شتێکی نا ئاساییە

وە وتنی ئەوەی کە ئەو دروستکارەی دروستکراوانی دروست کردووە ڕوحی بۆ دروستکردوون شتێکی ئاساییە ..

٢)بێتەل : وایەرلێس

وە کاتێـک ئـەو وردی و پتـەوی و ڕێـک و پێکییـەی سسـتمی گەردوونمـان بینـی هـەر لـە جووڵـەی گەردیلـەوە تـا خولانـەوەی خولگـەکان .. وە وتمـان کـە .. نموونـەی ئـەم گەردوونـە پتـەوە ناکرێـت تیایـدا سـتەمکارێک بـۆی دەرچێـت .. وە هـەر دەبێـت لێپرسـینەوە و سـزا هەبێـت بـۆ هـەر کەسـێک کـە لـە دەسـت سـزای دونیـا دەردەچێـت .. ئـەوا قسـەکەمان ئاسـایی و لۆژیکـی دەبێـت لەگـەڵ هەمـوو پێشـەکییە زانسـتییە بینراوەکانـدا .. چونکـە یـەک بەڵگـەی زانسـتی بوونـی نییـە لەسـەر بێ سـەر و بـەری لە یاسـاکانی سروشـتدا .. وە بێگومـان دەبێـت دروسـتکاری ئـەم سروشـتە ناوازەیە دادپـەروەر بێـت ..

وە ئـەو کەسـەی زینـدوو بوونـەوە بـەدوور دەزانێـت و .. بـاوەڕ بـە (د . برنـار) پزیشـکی نەشـتەرگەری دەکات کـە دڵـی پیاوێکـی مـردوو زینـدوو دەکاتـەوە بـە گواسـتنەوەی بـۆ جەسـتەی کەسـێکی زینـدوو و زینـدوو دەبێتـەوە .. بـەڵام ئـەوە بـە درۆ دەخاتـەوە کـە ئـەوەی برنـار و ئـەو گەردوونـەی برناریشـی تێـدا دەژی دروسـت کـردووە، بتوانێـت زینـدوو بوونەوەیەکـی لـەم شـێوەیە بـەدی بهێنێـت , کەسـێکی خـۆ بـەزل زانـە و تێگەشـتنی سـنووردارە ..

وە هاتنـی ئـەم ڕاسـتییانە لەسـەر دەسـتی دەشـتەکییەکی نەخوێنـەوار کـە نووسـین و خوێندنـەوە نازانێـت .. وە قورئانێکمـان بـۆ بهێنێـت مێـژوو بگۆڕێـت و چوونیـەک بێـت لەگـەڵ دۆزینەوەکانـی زانسـتدا تەنانـەت هـەزار و چـوار سـەد سـاڵ پێـش ئـەوەی ئـەم دۆزینەوانـەش بکرێـت ..

ئەمە کارێکە بە سروش و لەلایەن ئەو خودایەوە نەبێت کە هەموو شتێک دەزانێت، هیچ ئەگەرێکی دیکەی نییە ..

وە ئەو کەسانەی ساویلکانە دەڵێن .. خودا ڕەحیمە و هەموو خەڵکی دەکاتە بەهەشتەوە .. ئایا دەکرێت خودا بەو گەورەییەی خۆی سەربخاتە سەری ئێمە و لێپرسینەوەمان لەگەڵ بکات لەسەر چەند قسەیەک کە کردوومانە و چەند کارێک ئەنجاممان داوە لە کاتێکدا ئێمە بەراورد بە خودا و گەورەییەکەی وەکو مێروولە یا دەنکۆڵەی گڵ و دەنکۆڵە تۆزین .. نا ژیرانەیە .. خودا زۆر گەورەیە گەورەتر لەوەی ئێمە ئەشکەنجە بدات .. ئەو کەسەی بەم جۆرە بیر لە خودا دەکاتەوە و پێی وایە باوەڕێکی زۆر بەرزی پێی هەیە .. لەبیر دەکات کە ئەو بەم ساویلکەییە داوای ستەم لە خودا دەکات و داوا دەکات ڕەش و سپی یەکسان بکات و ستەمکار وەکو ستەملێکراو لێبکات و بکوژ وەکو کوژراو لە بڕیارەکانیدا .. ئەمە خودی پشێوییە ..

وە ئەگەر یەک تۆز کیمیا و سروشتی بخوێندایە دەیزانی کە خودا لە نێوان گەردیلەکانیشدا یەکسانی ناکات .. تەنانەت گەردیلەکانیش .. هەموو شتێک بە ڕێکی دەجوڵێت لە ئەلکترۆنێکی بچووکەوە تا مەجەڕەە ئاسمانییە گەورەکان .. بە گونجاوی لەگەڵ لۆژیکێکی زانستی ورددا و .. گەردیلەکان لەسەر بنەمای بارستە گەردیلەکانیان یەکدەگرن و کارلێک دەکەن لەگەڵ یەکدا لەگەڵ ئەوەی بڕی ئەم بارستانە زۆر زۆر بچووکە،وە بە خوێندنەوەی سەمەرەکانی گەردوون و وردی جووڵەی و پتەوی و پێشکەوتنی ئاوەز هاوار دەکات ..

لـە نێـوان دەسـتەکانی ئـەم ماوەیـەدا هیـچ سـتەمکارێک ناتوانێت قورتـاری بێـت و هیـچ بکوژێـک ناتوانێـت هەڵبێـت بەهـۆی هەڵەکردنی یاسـاکانی زەوییـەوە ..

دادپەروەری چاوەڕێی هەمووان دەکات ..

ئـەم وردبیـن و تەلسـکۆب و ترمۆمەتـر و بارۆمەتـرە هەمـان ئـەوە دەڵـێ کـە پەرتووکـە ئاسـمانییەکان دەیڵێـن ..

ئەوانیـش تاکـە پەرتووکـن وەڵامێکـی مەتەڵـی مـەرگ دەدەنـەوە کـە تـا ئێسـتاش ئاڵنـگاری هەمـوو زانسـتەکان دەکات ..

# مەتەڵی مەرگ

بیست ساڵ لەمەوپێش .. لە ژووری توێکاری کۆلێژی پزیشکیدا وەستاین ..

هەر چوار کەسە و لەبەردەم بەشێک لە بەشەکانی لاشەدا ..

ئەو کات ئێمە واماندەزانی کە حەقیقەتی مرۆڤ مەتەڵ نییە و ..

چەقۆی نەشتەگەر دەتوانێت بەیەک لێدان ئاشکرای بکات و .. جەستە تەنها جانتایەکە کە کردتەوە هەموو شتێکت زانیوە..

بەڵام دوو ساڵی دوور و درێژ تێپەڕی .. من هەر خەریک بووم دەگەڕام .. تەماشای پشت گۆشت و ئێسک و .. ڕیخۆڵەکان و ملوولەکان و کڕکڕاگەکانم دەکرد ..

بەبێ هودە بۆ ئەو حەقیقەتە دەگەڕام .. دڵم کردەوە .. دوو سییەکەم کردەوە .. تا کۆتاییەکەی بە دوای دەمارەکاندا ڕۆیشتم ..

لەگەڵ دڕکە پەتکدا تا مێشک ڕۆشتم .. مێشکم کرد بە دوو بەشەوە .. هەر بەشێکیشم کرد بە دوو نیوەی ترەوە ..

لە کۆتاییدا گەشتم بە بارستەیەکی مەڵهەمی سپی ..مامۆستاکە دەربارەی وتی کە .. ئەوە نهێنی مرۆڤە..


٥٠٠٠ هەزار دینار


ISBN: 978-9922-626-13-0






07501269689
07701932749


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک- نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)